

لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ڕەمەزان ئاسۆیەکی نوێ..

فیزیای پزیشکی!

نانبڕاوێك!

نوستنێکی تەندروست!

زیرەکی باڵوڵ!

پاداشتی بەخشین!

داهێنەر کێیە؟

لەگەڵ ئەحمەد موختار بەگی جاف دا

50
ساڵی پێنجەم - تەمموزو ئابی 2012

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی پێنجەم - ژمارە 50 - تەمموزو ئابی 2012


# NO. 50

کارگێڕی و بازاڕسازی









**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر - شەقامی تاران - کۆمپانیای ڕەسەن - نزیك وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێبوون

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٢٣٠ - ٠٧٧٠١٥٤٢٣٩٧

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

**بەشی ڕیکلام**

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧



دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك
٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر



# ڕەمەزان ئاسۆیەکی نوێ..

لەگەڵ دەرچوونی ژمارە (٥٠)ی گۆڤاری بڕپاردا، میوانێکی زێدە ئازیز، دەبێتە میوانمان، کە دەمێکە دەستەو نەزەر لە چاوەڕوانیدا بە تاسەوە ڕاوەستاوین.

بەخێرهاتی، بە هاتنت هێندە خۆشحاڵین، شاگەشکەین، نازانین چۆن بەرەو پیریت بێینو بە چی ئاوازێك پێشوازیت لێ بکەینو بە چی وشەیەك گوزارش لە هەستو سۆزو خۆشەویستی خۆمان بکەین.

هەزاران جار بەخێربێیت، ئەی ئاوێزانی گیانو هاودەمی دڵو هاوڕازی ڕۆح.

بە هاتنت لەم چلەی گەرماو گڕەیەدا، وەکو شەونمی یەکەم بەیانی بەهار، وەکو پرووشەی بارانێکی نەرم، فێنکی بە دەروونمان دەبەخشیت.

لەسەر لێوی وشکمان، ئەفسوناویترین زەردەخەنە دەنەخشێنیت..

دڵەکانمان سپی دەکەیتەوە وەکو زیو..

دیدەکانمان دەکەیتە دەریایەك لە نور، لەگەڵ خۆتدا باخچەی ماڵەکانمان پەپوولەباران دەکەیت..

هەموو ئێوارەیەك گەرووی مان بە شیرینتر لە هەنگوین، شیرین دەکەی..

تا تۆ نەیەیت ئێمە هەژارانمان بیر نییە!

تا تۆ نەیەیت، مرۆڤایەتی خۆمان بیر ناکەوێتەوە!

تا تۆ نەیەیت، دەوروبەری خۆمان نابینین، تەنها لە شەوە زەنگا، تارماییەکان بەدی دەکەین..

تا تۆ نەیەیت، بیرمان نییە دەستێك بە کاکۆڵی منداڵە بێ باوکە بێنازەکاندا بهێنین.

بیرمان نییە فرمێسکی چاوێك بسڕین..

نامانپەرژێ ئێوارەیەك، بە پریاسکەیەکی بچکۆلەوە، خۆمان بە خانوچکەی هەژارێکدا بکەین..

تا تۆ نەیەیت، ئێمە چێژی هیچ شتێك ناکەین!

نە ئاوی سارد، نە دەنکە خورمای تەڕو پاراو، نە پاقلاوای خۆشو شیرین..

هەمیشە ماندووین، گەرومان تاڵ، خەیاڵمان پرشو بڵاو، سەرگەردان، شەکەتو بێ حەواس..

بێ ئامانج ملی ڕێ دەگرین، تەنها هەست بە جوڵەیەکی بێ گیانی شتەکانی دەوروبەرمان دەکەین، هەمیشە هەستدەکەین تەنیاین!

هەمیشە لە دڵەڕاوکێداین، هەمیشە دەترسین، هەمیشە چاوەڕوانی ڕووداوی کتوپڕین..

هەمیشە بە دووی سەرابدا ڕادەکەین!

هۆ میوانە ئازیزەکە، کە تۆ دێیت حەزدەکەین، لە باوەشتدا تێر تێر بگرین، گەر مە شینێ بۆ عومری بابردووی خۆمان سازکەین..

تکا دەکەین، خێرا وەرە، دەزانی باری تاوانی سەرشانمان چەندە قورسە، دەزانی پەڕاوی کرداروو گوفتارمان چەندە ڕەشە؟!

دەزانی چەندە دڵشکاوو ڕەنجەڕۆو خەمبارین؟!

دەزانی چەندە پەشیمانو شەرمەندەین؟!

چاوەڕوانین، لە بەردەرگای ماڵەکانی پەروەردگار، بە چراوە چاوەڕوانین، بۆ هەڵاتنی هیلالت ڕوو لە ئاسۆین!

وەرە توخوا، با غەرقی نوری پڕ میهری ئیلاهی بین، با تەپوتۆزی ئەم دونیا نەگریسە، بە بارانی ڕەحمەتی خودایی بشۆرین، با دڵەکانمان بە تیشکی نور، بکەینە دەریایەك لە زیو..

تۆ میوانی ئێمە بیو ئێمەش میوانی کردگار، با بەچاوی فرمێسکەوە، با بە هەنیسکی گەرمەوە، داوای لێخۆشبوون بخوازین..

با پشوویەك بدەین، بە ڕۆحو لاشەی ماندوومان، با لە ژێربالی سۆزو میهری تۆدا، لە مانگێکی ئەرخەوانیدا، بەسۆزو خۆشەویستییەوە بژین..

بەخێربێیت، ئەی میوانە ئازیزەکە، مانگی ڕەمەزان، وەرزی گوڵستانی تەمەنو ژووانی دڵو دەستە سپیو بێگەردەکان..

# کارگێڕی بە گوفتار

موسوڵمان ئەو کەسەیە، کە خەڵکی لە دەستو زمانی دڵنیان.

پێغەمبەر (د. خ)

ئەگەر خۆمان خراپەمان تێدا نەبووایە، هەستمان بە خۆشی نەدەکرد، کاتێك لە بەرامبەرەکەماندا دەیبینین.

لارو شفوکو

ئاینده موڵکی کەس نییە، ئاینده تەنها موڵکی خودای گەورەیە.

فیکتور هۆگۆ

سەربەرزی، هەمیشە دەدرێت بەو کەسانەی کە خەوی پێوەدەبینن.

شارل دیگول

کاتێك مرۆڤ لێپرسراویێتییەکی گشتی وەردەگرێت، دەبێت خۆی بە موڵکی گشتی بزانێت.

توماس جونسون

هەرگیز خەمبار نەبووم، هێندەی خەمباریم، بە هۆی لە دەستدانی کاتژمێرێك خوێندنەوەوە.

مونیتسکو

## كارگێڕی بە چیرۆك

# فیزیای پزیشكی!



لە یەكێك لە كۆلێژە پزیشكییەكاندا خوێندكارەكان، ئامادەی وانەیەك بوون، لە زانستی فیزیادا، كە بەشێك بوو لە پرۆگرامی خوێندن.

كاتێك مامۆستای فیزیا مەسەلەیەكی فیزیكی ڕوونده‌كردەوە، یەكێك لە خوێندكارەكان، هەڵوێستەیەكی بە مامۆستا كردو پرسی: دەتوانم پرسیارێك بكەم؟

مامۆستاش گوتی: بەڵێ، فەرموو..

خوێندكارەكە پرسی: بۆچی ئێمە لە كۆلێژی پزیشكی فیزیا دەخوێنین، من هیچ پەیوەندییەك لە نێوان وانەی فیزیاو زانستی پزیشكیدا نابینم؟!

مامۆستا ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان گوتی: بۆئەوەی ڕۆحی مرۆڤەكان لە مەترسی ڕزگار بكەین!

دواتر دەستی بە بابەتەكەی خۆی كردەوە..

بەڵام خوێندكارەكە نەیویست بێدەنگ بێت، دووبارە بابەتەكەی بە مامۆستا بڕی‌و گوتی: ئاخر چۆن دەتوانین بە فیزیا، ڕۆحی مرۆڤەكان لە مەترسی ڕزگار بكەین؟

مامۆستاش بە نیگەرانییەوە لە وەڵامدا گوتی: كاتێك فیزیا دەخوێنین، خوێندكارە نەزانەكانی هاوشێوەی تۆ، كە هیچ ئایندەیەكیان نابێت لە زانستی پزیشكیدا دووردەخەینەوە، بەم كارەشمان ڕۆحی مرۆڤەكان لە مەترسی ڕزگار دەكەین!

لەم چیرۆكەوە فێردەبین:

١- پاراستنی ڕۆحی مرۆڤەكان لە مەترسی، گەورەترین ئامانجە كە دەبێت دەوڵەتو دامودەزگا جۆراوجۆرەكانی، لە پێشەوەی هەموو ئامانجەكانەوە ڕیزبەندی بكەن.

٢- ئەو كەسانەی كە ڕۆحی مرۆڤەكانیان پێ دەسپێردرێت، دەبێت زۆر بە وریایی‌و وردبینیەوە هەڵبژێردرێن‌و بە چەندین فلتەردا تێپەڕن، تا باشترین پاسەوانی ڕۆح‌و گیانی هاونیشتمانیان بن‌و ژیانی خەڵكی نەخەنە مەترسییەوە.

٣- بەدەستهێنانی نمرەی بەرز، یاخود لە داهاتوودا وەرگرتنی بڕوانامەی باڵا بەس نییە، بۆ بەخشینی متمانە بە پزیشكێكی پسپۆڕ، ئەگەر ئاكاری بەرزی مرۆڤانەی لەگەڵدا نەبێت.

٤- فێربوون‌و شارەزابوون‌و وەرگرتنی زانست، ئارامی‌و ئارامگرتنی دەوێت‌و گوێڕایەڵی مامۆستای زاناو بە ئەزموونی دەوێت.

٥- هزرو بیری فراوان‌و ئاسۆی بیركردنەوەی بێ سنور، مرۆڤ بەرەو فێربوون‌و شارەزابوون دەبات، بە پێچەوانەشەوە بیری تەسك بەربەستە لە بەرامبەر فێربوون‌و گەشەپێداندا.

٦- گەورەترین ستەم لە میللەت دانانی مرۆڤی كەمتەرخەمە كە هەستی بەرپرسیارێتی لاوازە، لەو شوێنانەی كە چارەنووس‌و ژیانی مرۆڤەكانی تێدا دەكەوێتە مەترسییەوە.

٧- مەرج نییە ئەوەی زۆر دەڵێ‌و زۆر پرسیار دەكات، كەسێكی زیرەك‌و لێهاتوو بێت، هەندێجار دەبینین سەرچاوەی زۆر بڵێیەكەی، تەنها نەزانینییە.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

## ئەگەر ناتەوێت سەرکردە بیت، ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

بەهێواشی بەرەو پێشەوە دەڕۆم، بەڵام هەرگیز بۆ دواوە ناگەڕێمەوە!

ئەبراهام لنکوڵن

دووربینیو زیرەکی گرنگترین سیفەتی سەرکردەی سەرکەوتوون!

تاسیتوس

یەکەم هەنگاوی سەرکردایەتی خزمەتکردنە!

جون ماکسویڵ

سەرکردەکان زۆر لە خەڵکی ناکەن، تا شوێنیان بکەون، بەڵکو ڕێگایان بۆ خۆش دەکەن!

تشارلز لویر

سەرکردایەتیو فێربوون، هاودەمن!

جون کینیدی

ئەو کەسەی دوژمنی نییە، شوێنەکەوتووانیشی نییە!

دون بیات

# ١٠٠ ئاماژە لـــە ژیانو بەڕێوەبردندا

و: ڕەهبەر مەسعود



**٥٤- وا مەکە بارودۆخەکان کاریگەری هەبێت بەسەرتەوە:**

هـــەر یەکێك لـــە ئێمە بارودۆخێکـــی تایبەتی هەیـــە، زۆرجار ئەم بارودۆخانە ناچاری دەکات لە شـــوێنی کارکـــردن ئامادە نەبێت، یان دوا بکەوێت، جا بارودۆخی خێزانی، یان نەخۆشی، یاخود کۆمەڵایەتی بێت، سەرۆکەکەشت بەردەوام ڕێگەت پێدەدات.

بـــەڵام ڕەنگە ئـــەم بارودۆخانە درێژە بکێشـــنو بـــەردەوام دووبارە ببنـــەوە، ئەو کات ســـەرۆکەکەت متمانـــەی زۆری بە تـــۆ نامێنێت، یان چیتـــر ڕێگەت پێنادات، چونکە هەموومـــان وەك تۆ مرۆڤین، کەواتە با بارودۆخەکان زۆر کاریگەرییان نەبێت بەسەرمانەوە.

**٥٥- لە بەرامبەر کڕیارەکانتدا، زەردەخەنە بکە:**

(یەکێك لە حەکیمەکانی ڕۆژئاوا گوتوویەتی: ئەگەر ناتوانیت زەردەخەنە بکەیت، ئەوا هیچ شوێنێك مەکە بە دوکان، یان هەر چەشنە شتێکی تر).

دەزانـــی بۆچی زەردەخەنە؟! چونکە یەکێکە لـــە کلیلەکانی چوونە نێـــو دەریای بـــێ بنی دڵ، ئەو کاتە دەتوانیت کاریگەری دروســـت بکەی بەســـەر دڵەکانەوە، تەنانەت ئەگەر کەســـی بەرامبەریشت نەناسی، بۆیە زەردەخەنە بکە لە ڕاست کڕیارەکانت. قسەیەکی زێدە گرنگی یەکێك لە زاناکان هەیە کە دەڵێت: (زەردەخەنە تێچوونی کەمترە لە کارەبا، بەڵام شەوقو ڕووناکی زیاترە).

**٥٦ ـ سیفاتی سەرکەوتووان:**

- ســـەرکەووتووان بەردەوام لە چارەســـەری کێشـــەکانیان دەگەڕێن، بۆیە ئەوان بەشێکن لە چارەسەر، نەك کێشە.

- ســـەرکەوتووان ئەو بوێریەیان هەیە، تاوەکو دان بە هەڵەکانیاندا بنێن.

- سەرکەوتووان زۆر جەخت لەسەر ئامانجو خەونەکانیان دەکەنەوەو خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە کاری بچووکو بێ سوود.

- سەرکەوتووان حەزو ئارەزوویەکی زۆریان هەیە، بۆ سەرکەوتن.

- سەرکەوتووان پشت بە خۆیان دەبەستنو لە شکست ناترسن.

- ئێستا ڕات چۆنە؟! منو تۆش لەوان بین.

**٥٧- حەزەکانت بەدەست بهێنە:**

هەر یەکێـــك لە ئێمە کۆمەڵێك حەزو ئارەزووی هەیە جا چ گەورە بێت، یـــان بچووك، ئەمەش مافێکی ڕەوایە بۆ هەموو کەســـێك، چونکە هەموو کەســـێك هەوڵدەدات چاکترو باشـــتر بێت لەو ساتەی ئێستا، کە تێیدا دەژیت.

بەڵام فەراهەمکردنو بەدەستهێنانی حەزو ئارەزووەکان بەستراوەتەوە بە کۆششکردنو ماندووبوونو دڵسۆزیو پاڕانەوە، دیسان پاڕانەوە، بۆئـــەوەی (خودای)گەورە حـــەزو ئارەزووەکانت بەدی بێنێت، بەڵام بەر لە هەموو شتێك پێویستت بە هەوڵو کارکردنە.

**٥٨- سەرکەوتن بە شانس (بەخت) نییە:**

وەك زۆربەی ئەو کەســـە شکســـتخواردووانە مەبە لە کاروبارەکانتو پەیوەندییە کەســـییەکان لەگەڵ کەســـانی تر، بە تایبەتی لە پەیداکردنی ڕزقو ڕۆزیت، کە ئەوان بەردەوام دەڵێن: پرۆسەی سەرکەوتن، پرۆسەیەکە پەیوەنـــدی بە شـــانسو نێوچەوان هەیە، ئەگەر بەمشـــێوەیە بێت دەبێ هەموومان لەماڵەکانمان چاوەڕوانی بەختو شانس بینو پاڵی لێدەینەوە، نەخێر کار بکە، دیســـان کار بکە، دیســـان کار بکـــەو چاوەڕوانی بەختت مەکە، چونکە بەخت خەیاڵێکەو لە واقیعدا بوونی نییە.

**٥٩- دۆڕان کۆتایی نییە:**

کاتێك لە پرۆژەیەکدا ســـەرکەوتوو نابیـــنو دەدۆڕێین، مانای ئەوە نییە هەموو شـــتێکمان لە دەســـتداوە، بەڵام ئەگەر پاشەکشـــەمان کرد، ئـــەو کات مانای وایە ئێمە زۆرمـــان دۆڕاندووە، چونکە کۆڵمان داوەو بە چۆکـــدا هاتوین، بۆیە پێویســـتە بە هەڵە لە چەمکـــی دۆڕان تێنەگەین، چونکە هەموو کەسێك دۆڕاندن لە فەرهەنگی ژیانیدا هەیە، دەی کەواتە ناتوانین هەمیشـــە بەشـــێوەیەکی عەقڵانیو بێ کەمو کوڕی کارەکانمان بەڕێوە ببەیـــن، هەروەها ڕێگاکانی قازانجو ســـەرکەوتنیش هەموو کات گوڵڕێـــژ ناکرێـــت لەبەردەممان، بۆیە پێویســـتە چاك ئـــەوە بزانیت کە دۆڕان کۆتایی نییە، بەڵکو سەرەتایە.

**٦٠- باشتر بە:**

بێگومان خەڵکانێك هەن کە لەلایەنی ســـەرکەوتنو بەدەســـتهێنانی ئامانجەکان لە پێشەوەی تۆن، ئایا تۆ ناتوانیت لەوان چاکترو سەرکەوتوو تر بیت؟!

بەهێمنیو لە ســـەرخۆیی، بەشێوەیەکی وردو قوڵ، بیر لەم پرسیارە بکەرەوە!

**٦١- چاوەڕێی هەل ڕەخسان مەکە:**

گریمان تۆ لەسەر پشتی کەشتیەکیتو لە ناکاو کەشتییەکە ژێر ئاو دەکەوێت، ئایا تۆ چاوەڕێی مەلەوانێك دەکەیت، بۆ ئەوەی ڕزگارت بکات، یان چاوەڕێی کەشتی فریاکەوتن؟! ئەی ئەگەر هیچ کام لەمانە نەبوون، چی دەکەیت؟

تەنها چارەســـەر ئەوەیـــە تۆ خۆت هەوڵی خـــۆ ڕزگارکردن بدەیت، کەواتە هەموو کات چاوەڕێی هەل ڕەخسان مەکە.

**٦٢- لە شکست مەترسە:**

ئەگەر تۆ بەردەوام لە شکســـتو شکســـتهێنان بترســـیت لە ژیان، ئەوا ئـــەم ترســـانە دەبێتە گەورەترین بەربەســـت لە پێش ســـەرکەوتنت، بەڵام ئـــەوەش بزانە هەموو کات شکســـتهێنان خراپ نییـــە، چونکە ڕەنگە ببێتە سووتەمەنییەکی گڕگرتوو، بۆ سەرکەوتنی داهاتووتو هاندەرێکی کڵپەسەندو بۆ بەدەستهێنانی حەزو ئارەزووەکان، کەواتە لە شکست مەترسە.

**٦٣- بەردەوام سەیری پێشەوە بکە:**

وا خەیاڵ بکە تۆ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن سەیری پیاوێك دەکەیت، ئەو کەســـە ســـەردەکەوێت بۆ سەر چیایەکی زۆر بەرز، دەبینیت ئەو بە هیچ شـــێوەیەك سەیری دواوە ناکات، تەنها لە پێشەوە دەڕوانێت، دەزانی بۆچی؟ چونکە ئەگەر ســـەیری خوارەوەی کرد، ئەوا چەند نمرەیەك لە ورەی دادەبەزێت، ئەو کات کاریگەری خراپی دەبێت بەسەرییەوە.

کەواتە بیرو هۆشـــی خۆت ســـەرقاڵ مەکە بە ڕابـــردووەوە، چونکە ڕابردوو مردووەو قەت ناگەڕێتەوە.

کارگێڕیزان



# پێویستیمان بە تەمەندرێژی نییە!!

ئا: م. هاژە شێروانی

دەڵێن: «کاتی بەڕێوەبەر هی خۆی نییە، چونکە ناتوانێت ئەوە بکات کە دەیەوێت، ئەوەش لەو کاتەی کە کەسانی تر تا رادەیەك کاتەکەیان بێبایەخە»، ئەمە وتەی (سەید هواری)یە، کە یەکێکە لە زانایانی کارگێڕی میسری، کەواتە چۆن دەتوانین پەیڕەوی سیاسەتی دەرگای کراوە بکەین؟ لە کۆمەڵگایەك کە ئاستەمە قسەی لەسەر بکرێت! چ جای پەیڕەوکردنی!!! ئەمەش لەبەرئەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە سەردانی فەرمانگەکان دەکەن، ئارەزوومەندن کە گەورەترین بەرپرسی ئەو دەزگایە ببینن، چونکە لە ڕوانگەی زۆرێکیان هەر ئەو برا گەورەیەو خۆی خاوەنی چارەسەرو بەیەکبەستنەوەیە، هەتا ئەگەر هاتوو داوات لێکرد کە چاوپۆشی لە یاساو مەنتیقو ئەخلاقیش بکەیت! ئەو کاتەشی کە دەرگایان بۆ دەکرێتەوە هاکا بینیت کەوتە ژێر فشاری دەروونیو کۆمەڵایەتیو .... هتد، بۆئەوەی کارەکەیان بۆ ڕایی بکات.

ئەمەش لە کوێو لە لای کێ دەبێت؟ لەو شوێنە دەبێت کە بەهاو پێوەرە مرۆڤایەتییەکان بنەوبارگەیان پێچاوەتەوەو یاساش پریاسکەی خستۆتەوە ناو سندوقێکی دارو بە بزمار تەختەڕێژی کردووە، لە لای ئەو کەسانەش پیادە دەکرێت کە نرخی کاتیان نییەو چاوەڕوانن کە بەڕێوەبەر لە نووسینگە، وەها پێشوازییان بکات، وەکو ئەوەی کە لە دیوەخان دابنیشنو مەجلیسەکە گەرم بکەن بە قسەو باسی بێ بنەما، لە چاو ئەو کاتە زێڕینەی کە لە بەردەستی کاکی بەڕێوەبەردایە.

هەر بە تەنها سیاسەتی دەرگای کراوە بۆ سەردانیکاران نییە، بەڵکو کارمەندەکانی دامەزراویش، هەر ئەوەندەی کە دەرگایان بۆکرایەوە، یەکە بە یەکە دێن بۆ گلەییکردن، یان بۆ داو نانەوە بۆ یەکتر، یان هەر هیچ نەبێت بیرت بخەنەوە کە ئەوان لێرەن، هتد.

کەواتە چی بکرێت باشە بۆئەوەی دەربازبین لە درەنگ کەوتنی مامەڵەی زۆرێك لەو هاوڵاتیانەی کە ڕۆژانەو چەندینجار سەردانی فەرمانگەیەك دەکەن، تا کارەکانیان بۆ ڕایی بکرێت! یان هەر هیچ نەبێت دەربازبین لە بەهەدەردانی کاتی دەوام لە بەخێرهاتنو خواحافیزکردنی میوانە نەبڕاوەکان! سنووردانان بۆ کارمەندە بێکارەکانی ناو دامەزراو، ئەوانەی کە بێکارییەکی داپۆشراوییان دروستکردووەو قورساییەکیشیان خستۆتە سەر حکومەتو فەرمانگەکەش دەبێت تەحەمووليان بکات!

ئەوەی کە لێرەدا پێویستە لەبەرچاوی بگرین، ڕەچاوکردنی کۆمەڵێك پێوەرو گێڕانەوەی بەهای کەسایەتییە بۆ خودی خۆمان، بۆئەوەی بەهای ئەو کاتەی لە دەستمانە بیزانین دەبێت، خۆمان ڕابێنینەوە لەسەر دڵسۆزی، دڵسۆزیمان بۆ کاتمان، هاوەڵانمان، هاونیشتمانیانمان، بۆ ئەو خاکەی کە خزمەتی دەکەین، نابێت بە تەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆمان بکەینەوەو چونکە لە ئایینە پیرۆزەکەماندا هاتووە: «ئەوەی بۆ خۆمان پێخۆشە، دەبێت بۆ براکەشمان پێمان خۆشبێت»، نابێت ببینە بەربەست لەبەردەم پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونی کاری فەرمانگەکەمان، شێوازی تیمی کارمان هەڵبژێرین، تا زۆرترین بەرهەم بدەین بەدەستەوەو جیاوازیش نەکەین لە نێوان سەردانیکارانو هەر کەسەو مافی خۆی پێبدەین، کاتێکیش کە سەردانی فەرمانگەیەکمان کرد، ئەوپەڕی هەوڵمان بدەین کە بە ڕیز بووەستینو نۆرە بڕی نەکەینو پەنا نەبەینە بەر واسیتەکردن لە ڕاییکردنی مامەڵەکەمان.

هەروەك (جەمیل محەممەد عەلی فارسی) کە یەکێکە لە زاناکانی جددە دەڵێت: خۆشحاڵبووم کاتێك بانگهێشتکرام لە لایەن ژووری بازرگانی، بەمەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ نێردەی بازرگانی فیللەندی بە سەرۆکایەتی خاتوونی سەرۆك کۆمارەکەی:

ئەمەی خوارەوەش هەندێك لە ڕازەکانی ئەو شەوەیە:

- سەرۆکی کۆڕگەی ئابووری جەددە ئەم زانیارییانەی لەسەر فیللەندا پێشکەشکردین، کە ئەمانەی بۆ دەرخستین، یەکێکە لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان، لە ڕووی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، لە ڕووی بەرزی داهاتی تاك. هەروەك زانیارییەکی سەمەرەی پێداین، لەوەی کە ئامارەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دەریخستووە کە

دانیشتوانەکەی لە بەختەوەرینی دانیشتوانی سەر ڕووی زەوین.

- جەنابـی وەزیری بازرگانیو پیشەسـازی فیللەندی، وەڵامی یەکێك لە ئامادەبووانی دایەوە لەسەرئەوەی، بۆچی دانیشتوانەکەی لـە بەختەوەرینـی سـەررووی زەوین؟ ئەویش ئەمەی بۆ شـەش فاکتەر گەڕاندەوە: فاکتەرێك لە خوداوە یەکێك لە خودی خۆیانو چوارەکەی تریش لە حکومەتەوەیە.

فاکتـەری یەکـەم دەریخسـتووە کە ئـەوەی لـە خوداوەیە، «بۆ ئاینەکەیـان ناگەڕێتـەوە»، بەڵکـو بـۆ سروشـتە جوانەکەیانە، ئەو فاکتەرەشـی کـە تایبەتە بە خۆیـان چێژ وەرگرتنیانە لە دڵسـۆزی کارکردن، هەرچی چوار فاکتەرەکەی تایبەتە بە حکومەت بریتییە لە:

یەکەم: بەرچاوڕوونیو نەبوونی گەندەڵی کارگێری: (هەروەکو ئـەوەی کـە بڵێت کـە هەر نییەو لـە بنەڕەتدا گوێبیسـتی هیچ ڕەشـوەیەك، یان شـتێکی لـەم بابەتە بووبین، یان شـتێکی نامۆ هەبووبێتو ئێمە پێی نەزانین).

دووەم: دادوەری کۆمەڵایەتی:

لـە پـاڵ دووپاتکردنـەوەی ئەوەی کـە جیـاوازی چینایەتی لەوپەڕی نزمیدایە.

سێیەم: سەربەخۆیی تەواو لە دادگادا.

چوارەم:فێرکردنی باش، لەگەڵ دەستەبەری تەندروستی زۆرباش.

- زۆر بـە خێرایـی ئاسـتەکانی پەرەپێـدان بەرزبوونـەوە لە فیللەندا، وتیشی: ئەوان لە بری ئەوەی کە دار هەناردە بکەن، وەکو ئەوەی لە پێشوودا باوبوو، ئێستا کاغەز دروستدەکەن، بۆئەوەی ببێت بە گرنگترین بەرهەمهێنەری کاغەز لە سەر ئاستی جیهان، هەر بۆیە داهاتەکـەی زۆر بـە خێرایی بەرزبووەوە، وەکو ئـەوەی کە وڵاتێکی خاوەن نەوت بنو سەیرەکەشـی ئەوەیە کە یەك بەرمیل نەوتی خاو هەناردە ناکەن، بەڵکو بەرهەمەکانی هەناردە دەکەن بە جیاوازییەکی زۆرەوە لە نرخی نێوان نەوتی خاوو بەرهەمەکانی نەوتی خاو.

- فیللەندا وڵاتێکە دانیشـتوانەکەی تەنها پێنج ملیۆن کەسەو داهاتی نەتەوەیشـی ٦٥٠ ملیار ڕیالە لە سـاڵێکدا، واتا گەورەتر لە داهاتی وڵاتانی ئەنجومەنی کۆمکاری کەنداو بە گشتی.

- سـەرباری بەرزبوونەوەی ئاسـتەکانی کرێی کارکردن، بەڵام هانایـان نەبردۆتە بەر هێزی کارێکی هـەرزان، لە وڵاتانی هیندو بەنگلادیشو پاکستانو فلیپین.

لێرەدا لەسـەروبەندی ئەوەبووم کە پرسیار لە جەنابی وەزیری فیللەندی بکەم، لەسـەر سەربەسـتی لە دەربڕینـی ڕای خەڵك بۆ گەلەکەی زامنکراوە؟!!! بەڵام ترسم لە وەڵامەکەی بۆ دروستبوو..

هـەروەك لە فیللەندا داهات (مووچە) نییە بەبێ کارکردن، بۆ هیچ کەسێك جگە لە پەککەوتەو کەم ئەقڵ.

- وڵاتێك خاوەنی پێنج ملیۆن دانیشتوان بێتو بەرهەمهێنەری ئامێـری نۆکیا بێت، بە واتـای ئەو گەلەیە کە زۆرترین بەرهەمی تەلەفۆنـی هەیە بۆ یەك کـەس، ئێمەش گەلێکیـن کە زۆرترین ئاڵوگۆڕ بە ئامێری تەلەفۆنەکانمان دەکەین.

- خەڵکەکەی دەڵێن «حکومەتەکەمان خاوەن ئەقڵە»

- کـەشو هـەوای وڵاتەکـەی زۆر سـاردە، هەر ئەمەشـە کە وایکردووە زۆرجۆری گیانلەبەریان نەمێنێت.

- ئەمەو جگە لەوەی لەم وڵاتە پەیڕەوی دەرگای کراوە ناکەن، بە پێچەوانەوە دەرگاکانیان هەمیشـە داخراوە، هەر بە ڕێکخستنو یاسـاش، هەموو کەسێك مافی خۆی بە تەواوی وەردەگرێتو بەس، بە بێئەوەی پێویسـتی بە تەمەندرێژی هەبێت، بۆئەوەی سەرجەم ئاواتەکانی بێتە دیو ئاستەنگەکانی بەردەمی تێبپەڕێنێت.

# نرخی کات!

## بە پێنووسی (شێخ محەممەدی خاڵ)

لـە هەمـوو شـت بەنرختر لە جیهانـدا کاتـە، چونکە ژیان بـۆ خۆی، هـەر زنجیرەیەکە لە کات، هەر هەناسـەیەك کە ڕۆی، ناگەڕێتەوە. کەوابوو هەرچییەکی تیابکەیت لە کاری بەکەڵك، بۆت دەمێنێتەوە، کە تیاشیا نەکەیت لە کیست دەچێ.

زۆرجار کارکردنێکی کەم، بووە بە مایەی دەسـتکەوتێکی زۆر گەورە، یان هەوڵدانی یەکێك، یان چەند کەسێك، لە چەند دەمێکدا، بووە بە مایەی زیندووبوونەوەی گەلێکی مردوو.. یان بیرکردنەوەی هەڵکەوتوویەك، بووە بە مایەی خۆشـیو حەسانەوەیەکی هەموو کۆمەڵـی ئادەمـی، لەبەرئەوە کات، لای مەردومی تێگەیشـتوو، لە هەموو شت بەنرخترو بەڕێزترە.

هەموو شتێك ئەگەر قەزاکردنەوەیەکی ببێت، کات هەرگیز قەزا ناکرێتەوە، هەر ساتێکی کە لەدەستچوو، جارێکی تر ناگەڕێتەوە.

بەڕاسـتی ئەو دەستمایەیەی کە تێکۆشـەر، کۆی دەکاتەوە لە ژیانیـا، کۆمەڵەیەکـە لە کات، کە دەبێ بـە زێڕ.. کە دەگونجێ بۆ هێندێکـی تر، ببێ بە دووکەڵی جگەرە، یان بە پرخەی خەو، یان بە یاریی چایخانەکان، یان بە چەقەو قسەکردنی بێهوودە، یان بە گەڕانو هاتوچۆی خۆڕایی.

گەلانی خواپێداو، چونکە لەمە گەیشـتوون، یەك هەناسـە لە کاتیـان، لە دەسـتنادەن، چونکـە بە لایانەوە وایـە، کە کات وەك ئیکسیر وایە، مسی قەڵب دەکات بە زێڕ، هەژار دەوڵەمەند دەکات، نەخوێندەوار دەکات بە خوێندەوارو هەزاران شـتی بە کەڵکی تیا دەدۆزێتەوە، هەزاران شتی بە فەڕی تیادا دروست دەکرێت.

گەلی بەدبەختی نەخوێندەواریش کاتی، لە تەنەکەی ژەنگاوی لـەلا بێنرخـترە، بەڵکو بـە دوژمنی خـۆی دەزانێت، هەمیشـە دەیەوێت بیکوژێ. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەس جنێو دەدەن بە کات، وا نیشـان دەدەن، کە ڕۆژگار خراپە، دەڵێت: ڕۆژی ڕەش، یان کاتی بەد، یان سـاڵی شـوم. لەگەڵ ئەمیشـە، کات هیچ گوناهێکی نییە، گوناهـ ئەگەر ببێ، هی خۆمانـە، کە دریغیو کۆتایی تیا دەکەین، بەفیڕۆ لە دەستی دەدەین.





# ٥٠٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێك...


ن: شیری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی


## چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت، لە ئۆفیسو ماڵ، لە کاتی خوێندنو کارو سەفەرو بازاڕدا...

**١٧٢- پرۆژەیەکی نوێ:**

ئەگەر سەرگەرمی پەیداکردنی کڕیار، یان هاوکارێك بوویت، یان بە کرێگرتنی بەڵێندەرێك، یا ئیشوکاری دەرەوەت، یان ناوماڵ، ئەوا دۆسییەیەکی نوێ بۆ هەرکارێکی نوێ بکەرەوە، تا لەو دۆسیەیەدا هەموو بیرۆکەو ئەندێشە، نامەگۆڕینەوە، گرێبەست، یاداوەرییەکانی ئەو پرۆژە نوێیە بپارێزێت، دوای کۆتایی هاتنی پرۆژەکەش خۆت لە هەموو پەڕەو نوسراوەکان ڕزگاربکە، ئەوانە نەبێت کە ڕەنگە لە پرۆژەیەکی داهاتوتدا سودیان لێوەربگریت.

**١٧٣- تێکەڵو پێکەڵی ڕەنگەکان:**

ئەگەر سەرت لەوەدەرنەچوو کە پێویستە چی بکەیت، لە خۆت رادەبینی کە لە تواناتدا هەیە سیستەمێکی تەندروست دابنێیت، ئەوا فەلەمی ڕەنگاوڕەنگ لە دۆسیەکانتدا بەکارمەهێنە، چونکە ڕووخسارێکی ئاڵۆزی هەیەو کاروباریشت لێگران دەکات، بە تایبەت ئەگەر سیستەمێکی ژمارەیی، یان هیجائیت هەبوو، لەم کاتانەدا دۆسییەی گەورەی ڕەنگاو ڕەنگ بەکاربهێنە کە دیمەنێکی سەرنجڕاکێشی هەیەو بە سانایی دەیان ناسیتەوەو لە یەکیان جیادەکەیتەوە.

**١٧٤- دۆسییەی گرێبەستەکان:**

ئەگەر سروشتی کارەکەت وا پێویستی کرد، کە لەگەڵ کەسو لایەنی تردا گرێبەستت هەبێت، دۆسیەیەکی گەورە بە ڕەنگێکی زەقو بریقەدار هەڵبژێرە، وەك ڕەنگی سوور بۆ نموونە، هەرجارێك کە گرێبەستێکت واژۆکرد، وێنەیەك لە گرێبەستەکە بگرەوەو لەو دۆسیەیەدا بیپارێزەو دۆسیەی لایەنی دووەمی گرێبەستەکەش لەناو هەمان دۆسییە گەورەی گرێبەستەکە دابنێ. ئەم شێوازی مامەڵەیە لەگەڵ گرێبەستدا بەردەوامی پێبدە، بەڵام ئەسڵی گرێبەستەکان کۆبکەرەوەو بەپێی کات، یان پیت ڕێکیانبخەو لە دۆسیەیەکی گەورەی تردا کە شیاوی فراوانکردن بێت، لە شوێنێکی تر، دوور لە تیاچوونو سوتان بپارێزە.

**١٧٥- لیستی جەردکردن:**

لە ماڵەوە، یان لە نوسینگەی کارەکەت، لیستێك پڕبکەرەوە بەناوی ئەو دۆسییەو نوسراوانەی کە لە ناو چەکمەجەو دۆڵابەکاندا پارێزراون، ئەم لیستە بە کەتیرە بلکێنە بە ڕووکاری چەکمەجەو دۆڵابەکاندا، لە هەریەك لەم لیستانەش کۆپییەك لە ناو دۆسیەیەکی تایبەتدا دابنێو ناوەڕۆکێکیش بۆ لیستەکان دروست بکە.

**١٧٦- سەرلەنوێ دەست پێبکەرەوە:**

ئەگەر نەتتوانی دیکۆمێنتێك لە یەکێك لە دۆسیەکانتدا بدۆزیتەوە، کەواتە ئەو کاتەی لە پۆلێنکردنو دەرزیلێدانو پاراستنی دۆسیەکانتدا خەرجت کردووە بەفیڕۆچووە، سەرلەنوێ دەست پێبکەرەوەو هەموو دۆسییەکانت بە تەواوی بپشکنەرەوە، وابزانە ئەوەی کە بە دوایدا گەڕاوی نەماوەو سەر لە نوێ کاغەزو نوسراوەکانت ڕێکبخەرەوەو بە شێوازێکی نوێ دۆسییەکانت بپارێزە.

**١٧٧- بەڵگەی گرەنتیو ڕێنمایی بەکارهێنەر:**

پاراستنی ئەو بەڵگەیەی کە گرەنتی ئامێرێکی نوێی تیانوسراوە کە بە تازەیی دەیکڕی، لەگەڵ ئەو نامیلکەیەی کە زانیاریت دەربارەی ئامێرەکە پێشکەش دەکاتو پێی دەوترێت ڕێنمایی بەکارهێنەر سودی زۆرە، چونکە کاتێك لە بەکارهێنانی ئامێرەکەدا پرسیارێکت بۆ دروست دەبێت دەتوانی بچیتەوە سەر ڕێنماییەکەو زانیاری بەسوودی دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامێرەکە لێوەربگریت، ئەگەر ئەو ئامێرە لە کارکەوت، یان کێشەیەکی هونەری تیادروست بوو، مافی خۆتە داوای چاککردنەوەی لەو شوێنە بکەی کە لێت کڕیوە لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا. هەندێجار ئەم بەڵگەی گرەنتیو ڕێنمایی کڕیارانە قەبارەیان گەورەیە، بۆ هەڵگرتنیان دەتوانین سوود لە جۆرە دۆسیەیەکی گەورە وەربگرین کە لە بەرهەمی (Anthes Universal)ەو وا دیزاین کراوە کە قەد بکرێو دوای ئەوەی بەڵگەو ڕێنماییەکەی لەناودا دادەنێینو قەدی دەکەیت، وەك کتێبێکی ئاسایی دەردەکەوێتو دەتوانی لەسەر ڕەفەو ناو دۆڵاب وەك کتێبێك دایبنێیت. ئەگەر بەڵگەی کڕینو گرەنتییەکەدا بڕگەیەك هەبوو داشکانی باج دەیگرتەوە، ئەوا هەموو ئەو پسوڵانەی ئەو داشکاندنە نیشان دەدەن کۆپی بکەو لە دۆسییەی باجەکەتدا بیانپارێزە.

# پلان + پەیامو شێوازی دروست = سەرکەوتن..

الخطة + الرسالة السليمة = النجاح

پلان + پەیامی بێگەردو سەلامەت= سەرکەوتن

زۆر کات بیستوومانە وتویانە: (ئەگەر پلانت نەبێت، ئەوا تۆ بەشێك دەبیت لە پلانی کەسانی تر)، یەکێك لە گرنگترین فاکتەرەکانی پلاندانانی سەرکەوتوو دیاریکردنی ئەو شتەیە کە دەتەوێت بەدەستیبهێنیت، دەتوانین ناوی بنێین: (پەیامداری، الرسالة، Mission)، پەیامداری پلان، گەورەترین کاریگەری هەیە لەسەر جێبەجێکردنی پلانەکەو سەرکەوتنو شکستهێنانی پلان، بۆیە لێرە ئێمە باسی شێوازو دیدگای ئەزموونە سەرکەوتووەکان دەکەین بۆ دانانی پەیام لە پلانەکانی خۆماندا، چ ئەو پلانە بۆ کارگەکەت بێت، یان بۆ کەناڵێکی تایبەتی خۆت، یان هەرجۆرە شتێکی پلاندار بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت بەو پەیامە دروستەی هەڵیگرتوە.

## دارشتنی پەیام (Mission Formulation):

هەر کاتێك بمانەوێت پەیامی خۆمان دابرێژین، پێویستە کۆمەڵە شتێك دیاری بکەینو وەڵامماں پێبێت.. گرنگترینیان:

* دەستنیشانکردنی کاری سەرەکی (بەرهەمهێنانی سەرەکی) کە دەمانەوێ پێشکەشی کارگەکەمان بکەین، واتە: دەتەوێت چ کارێك پێشکەشی کارگەکەت بکەیت؟

* دەستنیشانکردنی خەڵك، یان بازارو شوێنی کارەکە، واتە: ئەو کارانەی دەتەوێ بیکەیت بۆ کێیە؟

* دەستنیشانکردنی رێگای سەرەکی کارگەکەت بۆ گەیاندنی بەرهەمو کارەکانت لە بازارو خەڵك.. واتە: چۆن کارەکانت جێبەجێ دەکەیت (لە چ رێگاگەلێکەوە)؟

* دەستنیشانکردنی هۆکارە سەرەکییەکان بۆ هەبوونی کارگەو دامەزراوەکەت.. واتە: بوونی ئەم کارگەیە بۆچی؟

* رێککەوتن لەسەر ئەو خاڵانەی کە کارگەکەت جوودا دەکاتەوە لە کارگەکانی تر، واتە: چ شتێك هەیە کارگەکەت جیا بکاتەوە لە کارگەکانی ترو گەشەبکات (Distinctive Competencies)؟

* دەستنیشانکردنی خاڵە بەهێزەکان کە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی کارگەکەت (لە سێ خاڵ کەمتر نەبێت)، ئەو خاڵانەشی کە خاڵی لاوازنو دەبنە رێگر لە پێشخستنی کارگەکە، واتە: چ شتێك وا دەکات کارگەکەو پرۆژەکەت بجووڵێنێ، (بەرەوباشبوون، یان بەرەو خراپبوون (Driving Forces)؟

### سیفەتەکانی پەیامداری:

- پێویستە ئەو پەیامەی کە پێمانە لە دامەزراوەو کارگەکەمان روون و ئاشکرا بێت بۆ هەمووان.

- پێویستە کورتو ئاسان بێت، (هەندێك دەڵێن پەیام نابێت لە ٤٠ وشە زۆرتر بێت)..

- هەڵگری وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بێت (What, Who, how, and Why))..

- لەسەر پلانێکی تۆکمەو ستراتیژی بنیاتنرابێت، ئامانجی دیاریکراو بێت.

- گوزارشت لە کارگەو دامەزراوەیەکی جیاواز لەوانی تر بکات، نەك کۆپی بێت..

- هەمیشە نوێنەرایەتیو مەرجەعی هەبێت، بۆئەوەی بتوانێت بڕیارەکانی ناوخۆی کارگەکەی دەربکات..

هەموو ئەمانە بۆ دارشتنی پەیامێکی سەلامەت لە نەخۆشی ناروونیو بێ ئامانجیو کۆپی بوون بوو، ئەم رێگایانەی سەرەوە بۆ دارشتنی پەیام هەمووی ئەزموونکراونو سەرکوتووبوون، بۆیە دەتوانی تۆش لە پلانەکەتدا جێبەجێی بکەیتو سەرکەوتن مسۆگەر بکەیت، مرۆڤی بێ پەیام لە ژیان هەمیشە دەبێتە کەرەستەی پلانی خەڵکانی تر، بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانیانو پراکتیزەکردنی رێگاکانی ژیان بۆ سەرکەوتن، بۆیە پەیامداربە تا بوونی خۆت بسەلمێنی..






محەممەد ئیسماعیل

کەریم سمکۆ

بەشی یەکەم



# دروستبوونی ڕێکخراوو ڕۆڵی لە پێگەیاندنی تاکەکاندا

زۆرێك لە ئێمە ئەگەر باسی ڕێکخراو دەکرێت، بیرمان تەنها بەلای ڕێکخراوە سیاسییەکانو مەدەنییەکاندا گوزەر دەکات، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی لە ڕێکخراو بڕوانین پانتاییەکی بەرفراوانمان پێدەبەخشێتو بنچینەی ژیان لەسەر گۆی زەوی بەندە بە دروستبوونی ڕێکخراوەوە بە گشتی. لێرەوە بابزانین پێناسەی ڕێکخراو لە ڕووی زانستییەوە چییە؟ زاناو بیرمەندانی ئەو بوارە چۆن تێڕوانینیان بۆ ڕێکخراوە دەربڕییوە؟

## ڕێکخراو بۆچی دروست دەبێت؟

بێگومان هەر ڕێکخراوێك کە لەسەرەتاوە دادەمەزرێت، ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە، ئینجا ئەم ئامانجە گشتی بێت، یان تایبەتی، هەمیشە ڕێکخراو دروستنابێت بێ تاکەکانی کۆمەڵگاو بێ ئامانجێکی دیاریکراو، بەڵام گرنگ ئەوەیە تاکەکانی ناو ڕێکخراوەکە وابەستەو متمانەیان بۆ هەمان ڕێکخراوە هەبێت کە کاری لەگەڵدا دەکەن، لە ژێر پرەنسیپی بەرژەوەندی گشتی، نەك وەکو ئێستا ئەو ئەندامانەی لە هەر ڕێکخراوەیەکدا هەن بەرژەوەندی خۆیان لە پێش بەرژەوەندی گشتی دەبیننەوە. بۆیە فەلسەفەی هەر ڕێکخراوەیەك بەوە دێتە پێناسەکردن کە دەڵێت: ڕێکخراوە لە کاتێکدا دروست دەبێت، ئەگەر چەند تاکێك هەوڵەکانیان یەکخست بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو، ئینجا ڕێکخراویش لە کاتێکدا بوونی هەیە، ئەگەر گروپێکی هەڵبژێردراو لە تاکەکان بەشێوەیەکی ڕێكو پێكو بێ جیاوازی هەڵسوکەوتیان کرد بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکە، بێگومان بەرژەوەندی گشتیش لە پێش بەرژەوەندی کەسی خۆی ببینێتەوە.

لێرەدا توێژینەوە کارگێڕیو سایکۆلۆژییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕێکخراوەکان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا شوێنی هەوڵو ڕەنجو ماندووبوونن، لە لایەن تاکەکانی نێو کۆمەڵگاوە، چونکە ئەو سەرکەوتنە کارگێڕییەو پێشبڕکێی تاکەکان لە پێناو بەدەستهێنانی پلەو پایەی ئیداری، وایکردووە کە خودی ڕێکخراوەکان جێگای شەکەتیو هەوڵدانی بێووچانبن، ئیدی هەر ئەمەشە کە وادەکات ڕێکخراوەکان بە گشتی بەردەوام لە گۆڕانو گەشەسەندندابنو داهێنانو بەردەوامی تێدا بەدی بکەن.

بۆیە ڕێکخراوەکان هەر جۆرە ئامانجێکیان هەبێت، یان بەدەربڕینێکی دیکە، ئەگەر ڕێکخراوەکان بەهەر شێوەیەك بونیاد نرابن، ئەوا دوو بناغەی سەرەکییان هەیە، هەر لەسەر هەمان بنچینەی ئەم دوو بناغەیەش فەلسەفەی ڕێکخراوە بەردەوامیو هەمیشەیی دیاریدەکرێت لە ڕێگای ئەمانە:

یەکەم: دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی تاکەکان.

دووەم: بەرهەمهێنان.

دەستەبەرکردنو بەرهەمهێنان، دوو فاکتەری سەرەکی بەردەوامبوونی ڕێکخراون لە هەر کۆمەڵگایەکدا، چونکە کاتێك ڕێکخراو هەستا بە جێبەجێکردنی، یان تێرکردنی پێداویستییەکانی بنەپایەو ئەندامەکانی، ئەو کاتە بەردەوامی ڕێکخراوەکە دەکەوێتە سەر ڕێچکەی خۆی، لە هەمان کاتیشدا هەمیشە ڕێکخراوەکان لە لایەن تاکەکانی نێو کۆمەڵگاوە داوای دەستەبەرکردنی پێویستیو ئارەزووەکانیان لێدەکرێت، ئەمەش لەبەرئەوەی چونکە خودی ڕێکخراوەکان ڕەنگدانەوەی داخوازییەکانی کۆمەڵگانو جێگای ئەوەن کە تاکەکان داوای دەستەبەرکردنیان لێ بکەن. چونکە هەر ڕێکخراوەکانن بە هۆی ئەو وشیاریو توانایەی هەیانە، گونجاوترین ڕێگەو ئامڕازییان لەبەر دەستە بۆ تێرکردنی پێویستی تاکەکان، بۆیە پێویستە ڕێکخراوەکان بوونی خۆیان بسەلمێنن، پێش ئەوەی پێویستییەکانیان تێربکرێن، چونکە ڕێکخراوەکان ئامڕازی دەستەبەرکردنن.

لە لایەکی دیکەیشەوە بەرهەمهێنانیش کردارێکی سەرەکییە کە ڕێکخراوەکان مومارەسەی دەکەن، ئەگەر شێوەو جۆری ڕێکخراوەکە هەر چۆنێك بێت. دەبێت ڕێکخراوەکان لە پاڵ دەستەبەرکردنو دەستەبەرکردنی پێویستیەکانیان، گرنگییەکی تەواو بدەن بە بەرهەمهێنان. ئینجا ئەو بەرهەمانەش لەهەر بوارێکدابن، لێرەدا بەرهەمی مەعریفی لەو نێوەدا سەرکیترینیانە.

بێگومان مەعریفەو پێشکەوتنو ڕۆشنبیریو بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگاش، لەسەر دەستی خوێندەوارانو تێگەیشتوانو بیرمەنداندا لە نێویشیاندا گەنجانی ئێستاو نەوەی نوێ بونیاد دەندرێت، لە وتەیەکیشدا ئەوەمان بە ڕوونی بۆ بەدیار دەکەوێت کە دەڵێت: (گەنج داینەمۆی وڵاتێکی پێشکەوتووە، هەموو داهێنانەکان لەسەر دەستی گەنج خۆی ئەنجام دەدرێت).

# نان و خشڵ!

ڕۆژێکیـــان پادشــایەك بڕیاریـــدا بەشــێکی ســـەروەتو ســـامانەکەی لە ڕێی خوادا ببەخشـــێت، لە هەمان کاتیشـــدا دەیویســـت بزانێت چارەنووسی سامانە بەخشراوەکەی چۆنو چی دەبێت؟

ئەوەبوو بۆ ئەم مەبەســـتە بانگهێشتی نانەوایەکی متمانە پێکراوی خۆی کرد، داوای لە نانەواکە کرد دوو نان دروســـت بـــکات، بە شـــێوەیەك لە هەویـــری یەکێکیانـــدا هەندێك لە خشـــڵەکانی دابنێتو نانەکەی تریش هەر تەنها لە ئاردو ئاو پێکهاتبێت.

بەمجـــۆرە دەبووایە نانەواکە نانێك لەو دوو نانە بدات بە یەکێك کە لە هەموو کەس زیاتر خۆپارێزبێت لە کاری خراپە، نانەکـــەی دیکەش بدات بە یەکێك کە لە هەموو کەس کەمتر خۆپارێزبێت لە خراپە، بۆ ڕۆژی دواتر، دوو پیاو لە بەردەمی دەرگای نانەواخانەکـــە وەســـتابوون، یەکێکیـــان جلوبەرگـــی کەسێکی خۆپارێزو دونیانەویستی پۆشی بوو، وەك ئەوەی زۆر خۆپارێزە لە کاروباری دونیا، بەڵام لە ڕاســـتیدا ئەو لە ناخی خۆیدا وەهانەبوو، بەڵکو تەنها بە ڕواڵەت خۆی واپیشـــاندەدا. پیاوەکەی تریش، ئەوەی کە هیچ قسەیەکی نەدەکرد، نانەواکە وای دەزانی ئەوە کەسێکە کە ئەو حەزی پێناکات.

نانەواکە هەستا ئەو نانەی کە خشڵەکەی تێدا حەشاردابوو، دایە دەستی ئەو پیاوەی کە جلوبەرگی کەسێکی دونیانەویستی لەبەرکردبوو، هەروەها نانە ئاساییەکەشی دایە پیاوەکەی تر.

کاتێك پیاوە هەڵخەڵەتێنەرەکە یەکســـەر دەســـتیکرد بە خواردنی نانەکەی، هەســـتی بە شتێك کرد، ئەو وای زانی کە ئەو ئەســـتوورییەی ســـەر ڕووی نانەکە گرێی هەویرەکەیەو لەبەرئەوەشـــە وەها کێشـــی نانەکە قورس بووە، بە چاوێکی تووڕەوە تەماشایەکی نانەواکەی کردو ئینجا ڕووی وەرگێڕایە لای پیاوەکـــەی ترو پێـــی گوت: ئایە نانەکـــەی خۆت لەگەڵ نانەکەی من دەگۆڕیتەوە؟ دەزانم تۆ زۆر برسیتو ئەم نانەش لە هی تۆ گەورەترە.

لەبەرئەوەی پیاوەکەی تر بە هەموو شـــتێك ڕازیبوو، ئەو شـــتە هەرچی بووایـــە، بۆیە ڕازیبوو بـــە گۆڕینەوەی نانەکە لەگەڵیدا. پادشا کە لە درزی کونێکی دەرگای نانەواخانەکەوە چاودێریی ڕووداوەکەی دەکرد، زۆر ســـەری سوڕما! بێئەوەی ســـیفەتی هیـــچ یەکێـــك لـــەو دوو پیـــاوە بزانێـــت، پیـــاوە هەڵخەڵەتێنەرەکە نانە ئاســـاییەکەی بـــرد، پیاوەکەی تریش کە بەڕاســـتی لە ناخیدا کەســـێکی باشـــبوو، توانی خشڵەکان بدۆزێتەوەو بە باشی بەکاریانبهێنێت.

پادشـــا نەیدەزانی چۆن ئەمە شـــیبکاتەوەو لێی تێبگات، نانەواکـــە گوتی: گەورەم من ئەوەم کرد کە فەرمانت پێکردم، پادشـــاش گوتی: بەڕاســـتی لە توانـــای هیچ کەســـێکدا نییە دەستکاریی قەدەری خوا بکاتو بیگۆڕێت.

بەڕاستی ئەگەر خودا بیەوێت ڕزقو ڕۆزیت بۆ دەنێرێت، بەشێوەیەك کە تۆ بە خەیاڵیشتدا نەیات..



و: محەممەد مێرگەیی



وەهاب حەسیب

# مێژووی بانك و كارەكانی

بانك دامەزراوەیەكی داراییە، ئامانجی پاراستن‌و بەگەڕخستنی دراوە، ساناكردنی مامەڵە داراییەكانە بۆ هەمیشە كڕیارەكان، (ئەوانەی بە بەردەوامی مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن)، شوێنێكی گونجاوە بۆ پاراستنی پارەو سامان.

جێگایەكە لە كاتی پێداویستیدا قەرزی دراوی نەختینەی لێدەكرێت، بەرامبەر بە پەیمانێك كە وەرگری دراوەكە دەیدات، یاخود لە كاتی دواكەوتنی وادەی دیاریكراودا كەسێك دەبێت بە ئۆباڵدار ( كفیل)ی قەرزدارەكە، بانك بەشێوەیەكی ئاسایی بڕێك پارە دەدات بەو كەسانەی پێویستیانە لە بەرامبەر بڕێكی دیاریكراوی (سوود) زیادەدا، ئەمكارە بانكە ئیسلامییەكان خۆیانی لێ بەدووردەگرن، چونكە لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوە كارێكی حەرامە، لە بری ئەو كارە بانكە ئیسلامییەكان خۆیان پێداویستییەكانی كڕیار دابین دەكەن، وەك: شوێنی نیشتەجێبوون، هۆكارەكانی گەیاندن ... تاد، دواتر بەشێوەی نەختینە، یاخود قەرز دەیفرۆشێتەوە بەكڕیار.

سەرەڕای ئەمكارانە بانكەكان كاری ئاڵوگۆڕكردنی دراو، فرۆشتنەوەی قەواڵە (سندات)و كۆمپیالە (چەك) ئەنجام دەدەن، بەرامبەر بە قازانجێكی دیاریكراو.

**مێژووی دروستبوونی بانك:** ساڵی (١٥٨٧) لە كاتی بەئاگاهاتنەوەی گەلانی ئەوروپادا لە ئیتالیا، بانكەكان گەشەیان كرد لە ژێر ناونیشانی (بانكۆ ریالیتۆ)، وشەی (بانكۆ) banco، واتای ئەو مێزانە بوو كە سەڕافەكان لە كاتی مامەڵەكردنیان لەگەڵ كڕیارەكاندا بەكاریاندەهێنا. هەرچی ڕیالیتۆیە ئەو پردەیە كە هەردوو لای شاری (ڤینیسیا) پێكەوە دەبەستێتەوە، لەو كاتەدا زیاتر بە بازاڕێك دەچوو تا پردێك، چونكە كۆگاكان بە هەردوو بەری پردەكەدا ڕیزیان بەستبوو، هەروەها ئەو پردە (ولیام شكسپیر) لە شانۆ نامەی (بازرگانی ڤینیسیا)دا ناوی هێناوە.

بانكی (دی ڕیالتۆ) دراوی لە مامەڵەكاران وەردەگرتو دەیپاراست، بەرامبەر بەو كارە پێویست بوو لەسەر خاوەن پارەكە چەكێك لە بانكەكە ڕابكێشێت (بەرامبەر بڕی دراوەكەی).

ساڵی ١٦١٩ لە ئیتالیا بانكێكی تر بنیاتنرا بەناوی (بانكۆ دی جیرۆ)، واتە بانكی حەواڵە، ئەم بانكە ڕێگایەكی تازەی داهێنا بە مەبەستی ئاسانكردنی مامەڵەكان، چەند نوسراوێكی بانكی خستە بازاڕەوە بەرامبەر ئەو بڕە ئاڵتونو زیوانەی لای بانكی (بانكۆ دی جیرۆ) دانرابوو، دواتر ئەم نوسراوانە لە بازاڕدا وەك دراوی نەختینە دەستاو دەستیان پێدەكرا.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، بانكەكان شێوازی جۆراوجۆریان لە خۆگرت، گرنگترین‌و ناسراوترین بانكی وڵات بریتیە: لە بانكی ناوەند (بانكی مەركەزی) ئەركەكانی بریتییە لە: دەركردنی دراو، ئاڵوگۆڕكردنی دراوی نەختینەو پاراستنی، دەستبەسەراگرتن‌و پاراستنی بازاڕی دارایی، بە گوێرەی پلانی حكومەت‌و جێبەجێكردنی ئەو پلانە، هەروەها لێرەو لەوێ بانكی جۆراو جۆری تر هەیە، وەك بانكی بازرگانی، بانكی دارایی كە كارەكانیان بریتین لە: بازاڕسازی پشك (سهم - پشكی دراو)و قەواڵەكان كە لە لایەن حكومەت‌و دامەزراوە داراییەكانەوە دەردەچێت. ئەمە مێژووی بانكە نوێیەكان بووە لە جیهاندا، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە یەكەم بانك لە مێژوودا، ئەو بانكەیە كە لە وڵاتی بابل لە عێراقی كۆندا دروستكرا، بەناوی خانەوادەی (خێزانی ئجیبی)ەوە ناسرابوو كە لەو ڕۆژگارەدا دەستیان بەسەر كاری ئاڵوگۆڕی دراودا گرتبوو.

**بانكی ئیسلامی:** بریتیە لەو بانكەی كە هەموو مامەڵە بانكی‌و وەبەرهێنانەكانی بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام جێبەجێدەكات، لەسەر بنەمای بەشداریكردن لە قازانج‌و زەرەردا.

لەم پێناسەوە دەكرێت ئامانجی بانكی ئیسلامی بەم شێوەیە دەستنیشان بكەین، ئامانجەكان هەڵقوڵاوی كێشەكانی كۆمەڵگان (كۆمەڵگا ئیسلامییەكان)، كێشە ئاماژەیە بۆ پێداویستییەك، یان ئارەزوویەك بە شێوەیەك پێداویستییەكە ئامانج بێت.

چارەسەر: تێركردنی ئەو پێداویستیەیە بە شێوازێك، گرنگترین پێداویستییەكانی كۆمەڵگا ئیسلامییەكان هەبوونی دەزگایەكی دارایی بوو كە بە شەریعەتی ئیسلام كاربكات، بە گوێرەی یاساو ڕێساكانی ئیسلام مامەڵەو وەبەرهێنان بكات، دوور لەهەر گومانێكی سوود(زیادە). بە بڵاوبوونەوەی بانكە ئیسلامییەكان لە كۆمەڵگا موسڵماننشینەكاندا، چارەسەری ئەو ئاریشانە پەیدابوو.

وەك مێژوو بانكی ئیسلامی لەساڵی١٩٤٠ لە مالیزیا، ساڵی (١٩٥٠) لە پاكستان، لە میسر ساڵی (١٩٦٣) لە لایەن (ئەحمەد نەجار) سەرۆكی پێشووی بانكی ئیسلامی كراوەتەوە تا ساڵی ١٩٦٧بەردەوام بووە، دواتر لە دەیەیی حەوتەمی سەدەی ڕابردووەوە بانكە ئیسلامییەكان وەك دیاردە دەركەوتن‌و باشتر ناسران، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، پاش هەر قەیرانێكی ئابووری زیاتر ئاوڕ لە كارو چالاكی بانكە ئیسلامییەكان دەدرێتەوەو دەبن بە جێگای بایەخی بازاڕو داەو دەزگا ئابوورییەكان.

گرنگی بانکی ئیسلامی: بانکە ئیسلامییەکان جۆرێك مامەڵەیان لە بواری بانکیدا داهێنا، کە پێشتر ئەو شێوازە لە بانکە نەریتییەکان (تقلیدی)کاندا نەبوو، لە بری بنەمای قەرزداریێتی (قەرزدەر، قەرز وەرگر)و دانانی دراو لە بانکەکاندا، بانکە ئیسلامییەکان کارییان بە بنەمای بەشداریکردن لە قازانجو زەرەردا کرد. سەرەڕای سیستەمی وەبەرهێنان لە هەموو بوارەکاندا کە شێوازێکی ئیسلامییە، وەك:

١- قازانجکردن (مرابحة): جۆرێکە لە جۆرەکانی فرۆشتن، فرۆشتنی کاڵایەکی دیاریکراوە بە (کڕیار)و خستنەسەری بڕێکی دیاریکراوە لە قازانج، کاڵای دیاریکراو بانك دەیکڕێتو پاشان بەبڕێك قازانج دەیفرۆشێتەوە بە کڕیار، یان پێش وەخت هەردوو لایەن ( بانك- کڕیار) گرێبەستێك دەکەن.

بانکە ئیسلامییەکە شمەکەکە بۆ کڕیار دەکڕێتو پاشان بە قازانج پێیدەفرۆشێتەوەو کڕیار بەشێوەی (بڕ- قست) نرخەکەی دەدات بە بانکی دیاریکراو، ئەمکارە بیانویەکە بۆ کڕیار کە ڕاستەوخۆ بەرهەمەکە لە خاوەنی یەکەمی بەرهەم، خزمەتگوزارییەکە نەکڕێت.

٢- ئیجارە(بەکرێدان): لەم شێوازەدا بانکی ئیسلامی هەڵدەستێت بە کڕینی عەقارێك، پاشان لەگەڵ کڕیادا گرێبەستێك واژۆ دەکات، لەگەڵ تەواوبوونی ماوەی گرێبەستەکەدا مافی خاوەنداریێتی دەگوازێتەوە بۆ کڕیار، لەگەڵ سەرپشکردنی کڕیاردا کە پێش وادەی دیاریکراو مافی خاوەنداریێتی بگوێزێتەوە، بەمەرجێك ئەو بڕە دیاریکراوە بدات کە لە گرێبەستەکەدا دیاریکراوە.

جۆرێکی تری ئیجارە ئەو جۆرەیە کە لە بواری عەقاردا نییە، بەڵکو ئیجارەکە بۆ کەڵکێکە وەك: کڕینی ئۆتۆمبێلێك، یان ...تاد.

٣- سەلەم: لە زاراوەی فیقهیدا واتە فرۆشتنی بەرهەمێك پێش وەرگرتنی بەرهەمەکە، لەم شێوازەدا کڕیار نرخی بەرهەمەکە دەدات بەر لەوەی بەرهەمەکەی ڕادەست بکرێت، پاش ئەوەی کڕیارو فرۆشیار لەسەرنرخێك پێکدێن، ئەمکارەش پێچەوانەی ئیتمان (الإتمان)ە.

٤- ئیستسناع (الاستصناع)(بەکردندان-داواکردنی دروستکردنی شتومەکێك): بریتییە لە گرێبەستێك لە لایەن دروستکاری (شمەکێك) لە لایەکو بانکی ئیسلامی لە لایەکی ترەوە، لایەنی دروستکار شمەکێکی دیاریکراو دروستدەکات بە گوێرەی مەرجەکانی بانکی ئیسلامی، بانکی ئیسلامی بەرهەمەکە پەسەند دەکات، پاشان شمەکەکە وەك بەرهەمێکی ناوخۆ دەناسێنرێت، سودی بانکی ئیسلامی بریتییە لە: بڕێك زیادەی نرخ دەخاتە سەر تێچونی گشتی بەرهەمەکە، بەرهەمە دروستکراوەکە بەپێی خواستی داواکراو دەبێت، وەك: شوێنی نیشتەجێبوون، ئامراز، ئامێرێکی بەرهەمهێن.. تاد.

٥- موزارەبە (المضاربة): لەم شێوازەدا لایەنێك پارە دابین دەکات، کارو وەبەرهێنان دەکەوێتە سەر لایەنەکەی دیکە، ڕێژەی قازانجیش بە پێی ڕێکەوتنی هەردوو لایەن دەبێت، لایەنی یەکەم تەنها مەترسی سەرمایەی (کارەکە ـ پرۆژەکە) لە ئەستۆ دەگرێت، هەرمەترسییەکی دیکە دەکەوێتە ئەستۆی وەبەرهێن.

٦- هاوبەش (المشارکة): لەم شێوازەدا لایەنێك سەرمایەی پرۆژەکە دابین دەکات، لایەنی دووەم کاری پرۆژەکە هەڵدەسوڕێنێتو لە بەرامبەردا بڕێکی زیادە پارە هەڵدەگرێت، بەهاوبەش ناودەبرێت، چونکە هەردوو لایەن هاوبەشن لە قازانجو زەرەردا، هەردوو لایەن لە ماوەی گرێبەستەکەدا سەرپشکن لە فرۆشتنی (پشك ـ بەش)ەکانیان بەلایەنی سێیەم.

٧- قەرزولحەسەنە: بریتییە لە قەرزێك بانکی ئیسلامی دەیدات بە قەرز وەرگر، بە کۆمەڵێك مەرجی دیاریکراو، لە کاتی وەرگرتنەوەی قەرزەکەدا بانکەکە هیچ بڕێکی زیادە ناخاتە سەر قەرزەکە.

دووەم: ئەو خزمەتگوزارییانەی کاری ئیتمانی لە خۆناگرێت:

ئەو خزمەتگوزارییانەن کە شێوەی خزمەتگوزاری بانکی لە خۆدەگرن، لەم بوارەدا بانکی ئیسلامی بەرامبەر کارەکانی بڕێك پارەی زیادە وەردەگرێت، هەمان خزمەتگوزارین کە بانکە ئاساییەکان پێشکەشی دەکەن، بەڵام لە چەند بوارێکدا جیاوازن.

١- حساباتی کراوە: خزمەتگوزارییەکە بانکی ئیسلامیو بانکە ئاساییەکان دابینی دەکەن بریتییە: لە بڕێکی پارە کە هەمیشە کڕیارەکان لای بانکەکان دایدەنێن، هیچ سودێکی ناچێتە سەر، ڕووبەڕووی هیچ مەترسییەك نابێتەوە، بەڵام بانکەکە دەتوانێت بڕێك پێشینەی دیارینەکراوی بخاتەسەر، هەندێك بانکە ئیسلامییەکان ڕێگا دەدەن بە ڕاکێشان لەسەر حیسابی کراوە (سحب علی المکشوف) بەو بازرگانانەی باریی داراییان چاکە پارە ڕاکێشن، بێ هیچ زیادەیەك بەڵکو قەرزەکە (وەك قەرزولحەسەنە) دەدەرێت بە چەند مەرجێکی دیاریکراو.

٢- ودائع لاجل (سپاردە بۆ ماوەیەك): بەشێوەیەکی بنەڕەتی، ئەم سپاردەیە جیاوازە لە هاوشێوەکانی لە بانکە ئاساییەکاندا، سپاردەکە بە بەبنەما دادەنێتو سودی دەچێتە سەر، هەرچی بانکە ئیسلامییەکانە وەك بنەما دەڕواننە سپاردەکەو مەرجی دانەوە بەڕێژەیەکی دیاریکراوە، بەڵام ڕۆڵی بانکی ئیسلامی بەنیسبەت سپاردەکەوە وەك بریکارێك وایە، لە بەرامبەر سوودمەندانی ئەو بڕە سپاردەیەدا.

ئەم بریکارە دوو شێوە لە خۆدەگرێت:

أ- بەسپاردەی گشتی ناودەبرێت، بەشێوەیەك بانکی ئیسلامی خزمەتگوزاری ئیتمانی دابینەدەکات لە ڕێگای دانانی دەفرێك (کردنەوەی حسابێك)ەوە کە قازانجی سپاردەکانی تیادا دادەنرێتو بە گوێرەی ژمارە (بڕی سپاردەکە × ماوەکەی دەکرێت) پاش بڕینی پشکی بانکەکە لە بەرامبەر بریکار، یان سەرپەرشتیاری کارەکەیدا.

ب- بریکارێك دیاریدەکات بۆ مودیعەکان سپاردەکانیان لە چەند پرۆژەیەکی دیاریکراودا دابنێن:

١- پاش ئەوەی بانکی ئیسلامی بەرامبەر ئەو بریکارییە، یان سەرپەرشتیارییەی کردویەتی بەشی بانکی لێدەبرێت، خاوەن سپاردەکان توێژینەوەی پرۆژەکان دەکەنو مەترسی پرۆژەکان دەخەنە ئەستۆیان، لە زاراوەی بانکە ئیسلامییەکاندا بە سپاردە تایبەت (الودائع المخصصة) ناودەبرێت.

٢- چارەسەرێکی دیکە ئەوەیە: لایەنی سێیەم دەبێت بە ئۆباڵداری سەرمایەی سپاردەکە، لایەنی سێیەم بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەستە بە بانکی ئیسلامییەوە.

٣- ئەم شێوازەیان بانکە ئێرانییەکان جێبەجێیدەکەن، ڕێژەی مەترسی زیاترە، چونکە بانکە ئیسلامییەکە بە سپاردەکان کار لە پرۆژەی دۆڕاودا دەکاتو دواتر چارەسەرێکی شەرعی بۆ دەدۆزێتەوە کە بریتیە لە: گرێبەستی سپاردەکە، گرێبەستی (دڵنیایی) کە سەرمایەیی سپاردەکە لەخۆدەگرێت.

حەواڵە: بریتییە لە گواستنەوەی پارە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، ئەمکارە وەك خزمەتگوزارییەك بانکە ئیسلامییەکان پێیهەڵدەستن لە بەرامبەریدا بڕێك پارە وەردەگرن.

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، ئەو خزمەتگوزارییانەی بانکە ئیسلامییەکان جێبەجێیدەکەن، گۆڕانکاریو پێشکەوتنی بەسەرداهاتووە بە پێی جیاوازی دیدگای شارەزایانی ئەو بوارەو بیروبۆچونەکانیانو پێشکەوتنی ڕۆژگار، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هاوڕاو هاودەنگن لەسەر ئەو بنەمایانەی کە ئاینی ئیسلام دیاریکردووە لە ڕێگەپێدانو یاساغکردنی مامەڵە جۆراوجۆرەکاندا.

بێگەرد فارس



# پێنج هەڵوێستە، بۆ مانگی پیرۆزی ڕەمەزان

مانگی ڕەمەزان مانگی چاکەو چاکەکاری، سەرەتاکەی ڕەحمەتە، ناوەندەکەی لێخۆشبوونە، کۆتاییەکەشی ڕزگاربوونە لە ئاگری دۆزەخ.

ئەم مانگە مانگی ئارام گرتنە، مانگی خواپەرستییە، مانگی یادی خوداو قورئان خوێندنە.

هەربۆیە کاتێك کۆتایی دێتو تەواو دەبێت دڵی موسڵمان دەگوشرێتو بۆ فیراقی خەم دای دەگرێت!

چەند کەسی دوور لە خودای گەورەی، لە خودای نزیك کردووەتەوە!

چەند بێبەشو بێ دەسەڵات، خودای گەورە پێی بەخشیون!

چەند کەسی خراپەکار لەم مانگەدا لێخۆشبوونی بەدەستهێناوە!

لەبەر ئەم هۆکارە پێشینەکانمان زۆر تامەزرۆی گەیشتن بەم مانگە پیرۆزەبوونو داوایان لە خوای گەورە کردووە بگەنە دیداریو بەدەستهێنانی ڕەحمەتەکانی!

پێش گەیشتن بەم مانگە چەند هەڵوێستەیەك دەکەین ئەوانیش:

هەڵوێستەی یەکەم: ئەگەر گەیشتیتە ئەم مانگە پیرۆزە ئەوە تۆ کەسێکی زۆر بەختەوەری، چونکە زۆرێك لە مرۆڤەکان تامەزرۆو بە ئاواتی گەیشتنی بوون، دونیایان بەجێهێشتووەو پێی نەگەیشتوون، هەربۆیە پێویستە سوپاسگوزاری خوای گەورە بیت، چونکە لەوانەیە هەر بە چوونە ئەم مانگە بەر ڕەحمەتو لێخۆشبوونی خوای گەورە بکەوی، بێگومان سوپاسگوزاریش دەبێتە هۆی بەرەکەتو زیاتربوونی نیعمەتەکانو سوودمەندبوونی زیاتر، سەرەڕای ئەوەش زۆرێك لە خەڵکی بەهۆی نەخۆشیو دەردەدارییەوە دەناڵێنو ناتوانن هەستن بە عیبادەتەکانو سوننەتەکان کە بەرامبەریان پاداشتی چەند قاتی عیبادەتەکانی پێش ڕەمەزان بەدەستدەهێنیت، کاتێك تۆ یەکێك نیت لەو نەخۆشو پەککەوتانە، مایەی خۆشحاڵیو سوپاسگوزارییە.

هەڵوێستەی دووەم: لە سەرەتاوە بۆ ئەم مانگە پەیمانێك ببەستەو نیازی خۆت بەکردنی کاری چاکەو وتەی باشو بەسوود دووپات بکەرەوەو هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو کارانە بدە، کە خودای گەورە پێی خۆشەو پاداشتی گەورەی بۆ داناوە، لەوانەیە کەسانێك چەند ڕۆژێکی کەمی ئەم مانگە تەمەنیان تەواوبووبێت، بەڵام بەهۆی نیازی باشیان بۆ کاروکردەوەی جوان لەم مانگەدا، تەواوی پاداشتی هەموو مانگەکەی بەدەستهێنابێت.

هەڵوێستەی سێیەم: ئاگاداری زمانت بەو دووربە لە وتنی وتەی نەشیاو، یان هەر وشەیەك کە پەروەردگار تووڕە دەکات، گرنگ ئەوە نییە لە کاتی بە ڕۆژووبووندا تەنها خۆت لە خواردنو خواردنەوە بە دووربگریت، بەڵکو پێویستە زۆر بە ئاگابیت لەو وتەو کردەوانەی کە پاداشتی ڕۆژوەکەت کەم دەکاتەوە، یان پاداشتت لە دەستبچێت، واتە دەبێت هەموو ئەندامەکانت بەڕۆژوو بن.

هەڵوێستەی چوارەم: مانگی ڕەمەزان مانگی تەوبەو پەشیمانییە لە گوناهو تاوان، وازهێنانی یەکجاریو گەڕانەوەیە لە کردەوەی خراپ، بە پێی چەندین فەرموودەی (پێغەمبەر) (دروودی خوای لێبێت) ئەگەر هێندەی ئاسمانەکانو کەفی سەردەریا گوناهت هەبێت، ئەوا بە تەوبەکردنێکی ڕاستگۆیانە لەگەڵ خوای گەورە لە هەموویان خۆشدەبێت، تۆش پەلە بکە بۆ بەدەستهێنانی لێخۆشبوون، چونکە تەوبەی ڕاستەقینە گوناهی چەندین ساڵەت لەو مانگەدا دەسڕێتەوە!

ئەگەر لەم مانگەدا بە نیازی تەوبە نیت، ئایا چ کاتێك بە نیازی؟

ئەگەر لەم مانگەدا بە نیازی گەڕانەوە نیت بۆ لای پەروەردگار، ئەدی کەی دەگەڕێیتەوە؟

تا ئەو ساتەی لە دونیایتو کار لە کار نەترازاوە، ئەوا هەوڵ بدە یەکێك بیت لەوانەی لێخۆشبوونی خوای گەورەیان بەدەستهێناوە.

هەڵوێستەی پێنجەم: یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە پێویستە زۆر بەگرنگییەوە بۆی بڕوانین خۆ ئامادەکردنە بۆ پێشوازی لەم مانگە پیرۆزە، ئەویش بە خوێندنەوەو دراسەکردنی حوکمو پێویستییەکانی ڕۆژو ئەو شتانەی کاریگەری باش، یان خراپیان هەیە، بۆئەوەی شارەزابیتو نەکەویتە هەڵەوە، (پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: «ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ بەندەیەکی بوێت، ئەوا لە دین شارەزای دەکات».



ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# نوستنێکی تەندروست!

نوستن بەخششێکی خواییە، کە تاکو ئێستاش بە تەواوی بە ئەندازەی خۆی گرنگیو نهێنییەکانی نەزانراوە، هەمیشە دەڵێین: ئێمە لە پاش شەکەتبوونو ماندووبوون بە درێژایی ڕۆژ، پێویستمان بە نوستنە، تاکو پشووبدەین..

بەڵام ئیستا لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە ئێمە پێویستمان بە نوستنێکی ئارامە بە بڕێکی تەواو، تاکو ببینە مرۆڤێکی تەندروستو دووربین لە توشبوون بەو نەخۆشییە سەردەمییانەی لەناومان دەبەن!

بۆیە نوستن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، چونکە نوستن قەرەبووی ئەو هەڵو کۆششانە دەکاتەوە کە بە درێژایی ڕۆژ بیرو جەستەمانیان ماندووکردووە، هەروەك چۆن ڕۆڵێکی کارای هەیە لە پاراستنی مرۆڤ لە ماندووبوون، تێکچوونی نوستنو ڕێکنەخستنی کاریگەرییەکەی نەرێنی دەبێت لەسەر ئەنجامدانی کارەکان بە درێژایی ڕۆژ، بەڵکو تەنانەت کاریگەری لەسەر هەستو سۆزو لایەنی دەروونیشمان بەجێدەهێڵێت. تەنها دەماغ نییە سودمەندە لە نوستن، بەڵکو لە نوستندا پشوودانو ئارامییەکی زۆر هەیە بۆ هەموو جەستە، وەك کردگار دەفەرموێت:

﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا .... ﴿٨٦﴾ ﴾

النمل. واتە: ئایا نابینن چۆن شەومان تاریککردووە بۆ پشوودانو ڕۆژیشمان ڕووناککردووە بۆ هەوڵدان، بەڵام بەداخەوە هەندێ کەس ڕۆژیان گۆڕیوە بەشەو، یان شەویان گۆڕیوە بە ڕۆژ، بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزاندا!

پزیشکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە باشترین نوستن ئەوەیە لە سەرەتای شەودا بێتو کاتژمێرێك نوستن پێش نیوەی شەو (١٢:٠٠) یەکسانە بە سێ کاتژمێر لە دوای نیوەشەو. پسپۆڕەکان دەڵێن: ڕۆیشتن بۆ نوستن لە کاتێکی دیاریکراوی سەرەتای شەوداو بێداربوونەوە لە کاتێکی دیاریکراوی بەیانیان زوودا، تەنها چالاکی ئەو ڕۆژە ڕێکناخات، بەڵکو ئەو کەسە ئامادە دەکات بۆ نوستنێکی تەندروست لە شەوی دواتردا.

ئەگەر دەتەوێت بە زوویی خەو باڵ بکێشێت بەسەرتدا، کاتێك دەچیتە ناو جێگای نوستن، ئەوا بەیانی زوو هەڵبسەو ئەمەش بە پلانو ڕێكو پێکی ئەنجام بدە، بەمەش دەبیتە خاوەنی باشترین جۆری نوستنو بە درێژایی ڕۆژیش لەوپەڕی تەندروستیو بەختەوەریدا دەبیت.

ئایا ئەمە نەبووە کە پێغەمبەر درودی خوای لێبێتو هاوەڵانی ئەنجامیان داوە؟!

ئایا پێغەمبەر درودی خوای لێبێت نەیفەرمووە: (وإياكم والسمر)، واتە: دەخیلتان بم لە قسەکردنو کۆبوونەوەی درەنگانی شەو، هەرگیز هاوەڵان شەونخونیان نەکردووەو تا درەنگانی شەو خەریکی قسەکردن بوبێتن، بەڵکو دوای نوێژی خەوتنان بە ماوەیەکی کەم نوستوون.

خشتەی ئەندازەی پێویستی مرۆڤ بە نوستن:

| تەمەن | کاتژمێرە پێویستییەکانی نوستن لە شەوو ڕۆژێکدا |
|---|---|
| منداڵی تازە لەدایکبوو: | ١٨ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (١-٣) مانگ | ١٦ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (٣-٦) مانگ | ١٥ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (٦-١٢) مانگ | ١٤ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (١-٢) ساڵ | ١٣ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (٣-٥) ساڵ | ١٢ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (٦-٨) ساڵ | ١١ کاتژمێر |
| منداڵ لە نێوان (٩-١٠) ساڵ | ١٠ کاتژمێر |
| نەوجەوان لە نێوان (١١-١٧) ساڵ | ٩ کاتژمێر |
| لە تەمەنی (١٨) ساڵو بەرەوژوور | ٧-٨ کاتژمێر |

لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا شەو بێداری کارێکی باشە، بەڵام بە نوێژو نزیکبوونەوە لە خودا، نەك بە قسەکردنو سەیرکردنی دراماکان.

سێ مەرجی سەرەکی هەیە بۆ دەستەبەرکردنی نوستنێکی

تەندروست:

١- ئارامی جەستەیی.

٢- ئارامی سۆزداری.

٣- ئارامی هزری (مێشکی).

بوونی گرفتێك لە هەریەك لەمانەدا، دەبنە هۆكاری تێكچوونی نوستن، بۆ نموونە هەوكردنی گیرفانەكانی لوت، یان بوونی كێشەیەكی خێزانی، یاخوود بیركردنەوە لە بابەتێكی دیاریكراو، هۆكارن بۆ تێكدانی نوستنو توشكردن بە كەمخەویی (insomnia) لە لایەكی تریشەوە، ماندووبونێكی زۆر دەبێتە هۆی زیادكردنی ڕێژەی نوستنو دەبێتە هۆی ئەوەی خەومان زۆر قورس بێت. هەموو مرۆڤێكی ئاسایی دەتوانێت ژیانی سروشتیو تەندروست بەدەستبهێنێت بە نوستنێك كە زیاد نەبێت لە (٧) كاتژمێری ڕۆژانە، ئەمەش ماوەیەكی زۆر گونجاوە بۆ پێویستییەكانی لەشو پشوودانو پاڵپشتی كردنی ئەندامە جیاوازەكان.

كۆمەڵێك لێكۆڵینەوە دڵنیامان دەكەنەوە كە زۆر نوستن، یان كەم نوستن، هەردووكیان زیانبەخشن بۆ مرۆڤ.

ئەو مرۆڤەی پابەندە بە شێوازەكانی نوستن، دەروونی خۆی دەپارێزێت لە داروخانو ڕووبەڕووبونەوەی خەوی ناخۆش، هەروەك چۆن خۆی لە زیانەكانی شەیتان دەپارێزێت، بەوەی كە بە تەواوەتی خۆی تەسلیمی كردگار كردووە.

**لە پێناو گەیشتن بە نوستنێكی تەندروست:**

* پێویستە ژووری نوستنەكەت لە كەشێكی تەندروستدا بێت، لە ڕووی پلەی گەرمیو هەواو ڕووناكییەوە.

* مەچۆرە جێگەی نوستن، ئەگەر پێویستت بە نوستن نییە.

* ئەگەر نیو كاتژمێر لە جێگای نوستندا مایتەوەو خەوت لێنەكەوت، ئەوا جێگاكەت بەجێ بهێڵەو خۆت سەرقاڵ بكە بە خوێندنەوەی كتێبێكەوە.

* دووركەوەرەوە لە ئەنجامدانی كاری قورس، ڕاستەوخۆ پێش نوستن.

* خۆت بە دووربگرە لە بیركردنەوە لە هەر كێشەیەك لە كاتی چوونت بۆ جێگای نوستن.

* پێویستە ماوەیەك هەبێت لە نێوان ژەمی خواردنو كاتی نوستندا " لە ١٠٥ كاتژمێر كەمتر نەبێت"و لەگەڵ دووركەتنەوە لە ژەمە پڕ چەورییەكان كە هەرسكردنیان كارێكی گرانە، ژەمی ئێواران با خواردنێكی سادەبێت.

* هەوڵبدە پێش نوستن بۆ ماوەیەك كتێب بخوێنیتەوە.

* دووركەوەرەوە لە بیركردنەوە لە بابەتە كاریگەرو مەترسیدارەكان لە پێش نوستندا.

* مەچۆرە جێگای نوستن تەنها بۆ نوستن نەبێت، واتە مەچۆرە جێی نوستن بۆ خوێندنەوە، یان پێداچوونەوەی پلانەكانت، یان تەماشاكردنی تەلەفزیۆن، سیسەمەكەت تەنها بۆ نوستن بەكاربهێنە.

* هەوڵبدە لە نوستندا نەبیت كاتێك ڕۆژ دەگۆڕێت بە شەو، یان شەو دەگۆڕێت بە ڕۆژ، بە تایبەت لە كاتی خۆرهەڵاتنی بەیانیان كە ئەم كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر تێكدانی كاری هۆرمۆنەكان.

* پێویستە نوستن بە ڕێژەی پێویست بەكاربهێنرێتو نەبێتە هۆی تەمەڵیو كات كوشتن.

* یادی خودا بكەو زیكرەكانی نوستن بخوێنەو پاشان بنوو.

چیا عەبدوڵا



# پەڕەیەكی سپی

فەیلەسوفی سكۆتلەندی (دیفید هیوم ) یەكەم كەس بوو كە پێشنیاری بیردۆزی پەڕەی سپی كرد، ئەم بیردۆزە دەڵێت: هەر مرۆڤێك كاتێك دێتە ژیانەوە هیچ بیروبۆچونو ڕایەكی نییە، هەموو ئەو شتانەی كە بیری لێدەكاتەوەو هەستی پێدەكات بەدەستیهاتووە لە قۆناغی منداڵییەوە تابەرەو سەر، مادەم عەقڵی منداڵ پەڕەیەكی سپییە، كەواتە هەر ئەزمونێك، هەركەسێك بەسەر ئەو منداڵەدا تێپەڕێت نیشانەیەك جێدەهێڵێت. كەواتە ئەو كەسەی گەورەبوو بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی كە فێری بووەو هەستی پێكردووەو ئەزمونی كردووە لە ماوەی تەمەنیداو بەهەمان ئەزموونو فێربوونیشی كار دەكات، ئەوەشی كەدواتر دەبێت ببن بەرهەمی ئەو ئامادەباشیو گونجانە سەرەتاییە وەك ئەرستۆ دەڵێت: (تاك بەهەر شتێك كاریگەر بێت دەریدەبڕێت)، ڕەنگە گەورەترین دۆزینەوەی مرۆیی لەسەدەی بیستەمدا سەبارەت بەسروشتی مرۆڤ دۆزینەوەی (وێنەی خود)بێت.

سودمەندی ئەم بیردۆزە ئەوەیە هەموو مرۆڤێك كۆمەڵێك تێگەیشتن سەبارەت بەخودی خۆی بەدەستدەهێنێت، لە چركە ساتی لە دایكبوونییەوە، بەم جۆرەش وێنەی خودیت وەك كۆمپیوتەرێكی بەرنامەڕێژ وایە لە عەقڵی لاواعیتو زیهنتدا، بۆئەوەی هەموو شتێك دیاری بكات كە دێت بەبیرتدا لە وتەكانتو هەستەكانتو ڕەفتارەكانت، بە بۆنەی ئەم هۆكارەوە، هەر گۆڕانكارییەك لە ژیانی دەرەكی كەسەكەدا ڕوویدات، ئەوا سەرەتا لە وێنەی زاتی ئەو كەسەوە گۆڕانكاری ڕوویداوە، واتە سەرەتا بە گۆڕانكاری لە جۆری بیركردنەوەت جۆری هەستكردنت سەبارەت بەخودو جیهانی دەرەوەت ڕوویداوە.

لە سەرەتای لە دایكبوونی منداڵەوە هیچ وێنەیەكی خودی نییە، وەك كەسێكی پێگەیشتوو هەموو بیروبۆچوونەكانی هەستەكانیو هەڵوێستە دەروونییەكانی، لە سەرەتای منداڵییەوە بەدەستیهێناوە، ئەو بەهایانەی كە تۆ ئێستا لەسەری بەرهەمی بیروبۆچونو وەرگرتنی ئەو شتانەیە كە قبوڵت كردون، وەك ڕاستییەك، كاتێكیش بڕوا بەشتێك دەهێنی لەسەرئەوەی كەڕاستیە، ئەوا دەبێت بەڕاستی لەلای تۆ، ئیتر ئەو بابەتە هەرچی بێت چەندێكیش ڕاست بێت، (چونكە تۆ ئەو كەسە نیت كە گومان دەبەیت وابیت، بەڵكو چۆن بیردەكەیتەوە دەبیت بەوە).

سەرچاوە: (غیر تفكیرك غیر حیاتك) نوسینی انتونی روبینز




زاهیر زانا

# هیوا هێزو هەتوانە

هیوا وزەی هەلگرتنی هەنگاوو توانای برینی ڕێگاو هێزی خۆڕاگرییە، بەرامبەر ئاستەنگو کێشەو کەندو کۆسپەکانی ژیانو بزوێنەرو داینەمۆی بەدیهێنانی ویستو حەزو خواستو خەونو خولیایەو هەمیشە بەرەو باشترو بەرەو پێشتر دەمانجولێنێت، داینامیکیەتی ژیان بەستراوەتەوە بەهیواوەو لەگەڵ کوژانەوەی مۆمی هیوا، تاریکی باڵ بەسەر کوچەو کۆڵانەکانی شاری ژیاندا دەکێشێتو تەمتومانی ڕەشبینیو ناکرێو نابێت بەری خۆری ڕۆشن دەگرێو ژیان بەبێ هیوا ناگوزەرێو بەهاری گەشەو نەشونمای نامێنێو سەراپای دەبێتە پایزو گەڵاڕێزان، گەر هیوا نەبوایە چۆن تۆوێکی وشکمان دەخستە ژێر خاکو چاوەڕێی گەشەمان دەکرد، چۆن دارێکی ڕەقمان بەزەویدا دەچەقانو دەمانەویست ببێتە درەختو گەڵای سەوز دەربکاتو میوەی شیرینی لێ بچنین، هیوا نەبێ هیچ نەخۆشێك خۆی ناخاتە ژێر نەشتەرو دەوای تاڵیش ناخاتە دەم، ئەوە هێزی هیوایە وا لە خوێندکارەکان دەکات جانتا بکەنە شانو ڕووەو خوێندنگە بڕۆنو پێنوس بگرنە پەنجەیان، بۆئەوەی فێربن بنوسن ئەلیف، پیت بە پیتو وشە بە وشەو قۆناغ دوای قۆناغ کڵپەی هیوا لە دەرونیاندا جۆش بدەنو بەئارامگرتنو پشوو درێژیو خۆڕاگرییەوە بەرەو بەدەستهێنانی زیاتری زانست بڕۆن.

ئەوە هیوای ژیانە لە منداڵیدا سەرەتا وامان لێدەکات فێری دانیشتن ببین، پاشان گاگۆڵکەو دارەدارەبکەینو پێ بگرینو ڕۆیشتنو ڕاکردنیش بکەینە خولیای سەرو هیوای داهاتوو بەردەوامی بەرێڕەوی ژیان بدەین.

هیوا هەتووانی خەمەکانەو هێزی ئەوەمان پێدەبەخشێ دوای هەر کەوتنێك هەستینەوەو جارێکیترو جۆرێکیتر هەوڵبدەین، کاتێك هیوا لە دڵمانابێ توانای کارکردنو تێکۆشانو متمانە بە خۆبوونمان پێ دەداو پشت بەخوا سەرکەوتنمان بۆ مسۆگەر دەکات لە تەواوی کایەکانی ژیانداو ڕێگای بەرەو پێشچونمان بۆ ئاوەڵا دەکات.

بەڵام گرنگە ئاگاداری هیوادرێژیبینو کە ڕێگای کارکردنو هەوڵدانمان لێدەگرێتو بە خەیاڵ پڵاویو دەستخەڕۆیی دەمانهێڵێتەوە، بەشێوەیەك هەر وابزانین زۆرمان کات ماوەو بڵێین لە داهاتوودا دەیکەینو هیچ جوڵەو هەوڵێکیش بۆ هێنانەدی ئەو خواستو ویستە نەدەین.

بێهیوایی واتە مردن، لە کاتێکدا هێشتا زیندوین، چونکە تینو تاوت لە ژیاندا نامێنێو لە گەشەو بەرەوپێشچونو هەوڵدان دەوەستیت، وەك وتراوە: (کاتێك پیری دێت کە هیواکان ببنە یادگاری)، بۆیە پێویستە لەگەڵ هێنانەدی هەر هیوایەك هیوایەکی باشترو بەرزتر بخەینەسەر، ئەوەتا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (کاتێك داوای بەهەشتتان کرد، داوای فیردەوس بکەن، کە ناوەڕاستو بەرزترین شوێنی بەهەشتە). باوەڕێکی پتەو بەخوای گەورەو حیکمەتی ئەو تاقیکردنەوانەی دەیهێنێتە ڕێگەمان، هیوایەکمان پێدەبەخشێت کە ڕێگرە لە ڕووخانو تێکشکانو هاندەرمانە بۆ سەرکەوتنو سەرفرازی، لەبەرئەوەی هەست دەکەین گەورەترینو فراوانترین هێز، کە خاوەنی ژیانو بوونە لە پشتمانەوەیەو فەرامۆشمان ناکاتو سەرمان دەخات.

بڕوانە لاپەڕەکانی مێژوو پاڵەوانەکانی هەر لە پەیامبەرانو داهێنەرانو دانایانو...هتد، تێدەگەی چەندە بە هیوابوونو لە کاتێکدا هەموو دەوروبەرو بارودۆخ دژبوون لەگەڵ بەدیهاتنی هیواو ئاواتەکانیان، بەڵام بێ هێوایی ڕووی تێنەکردوونو سەنگەریان چۆڵ نەکردووە، تا لە کۆتاییدا دەرگا داخراوەکانیان کردۆتەوەو خواستەکانیان بەدیهێناوە، مێژوو پڕیەتی لە نموونەی جوانو درەوشاوەی ئەو کەسانەو پەڕەی داهاتووش ئامادەیەو دەتوانی لە ڕیزی کەسە هیممەت بەرزو هیوا بڵندەکاندا، ناوی خۆت تۆماربکەی.



# داهێنەر کێیە؟

و: پشتیوان موبارەك

هەندێــك کەس وادەزانن مرۆڤی داهێنەر هەر بە داهێنەری لە دایکبووە، ئەمەش تێگەیشتنێکی نادروستە، بۆیە بە کورتی دەڵێین: هەموو کەس دەتوانێت داهێنان بکاتو کاری نوێ ئەنجام بدات، جگە لەو کەسانەی خۆیان نایانەوێت!

داهێنەر: ئەو کەسەیە کە بیرۆکەی نوێو نائاسایی دادەهێنێت، یــان بیرۆکەیەك گەشــە پێــدەدات کەس پێش ئــەم بەرهەمێکی جیــاوازو تایبەتــی لێــوە بەرهەم نەهێنــاوە، کە نائاســاییو باو نەبووبێت، کە بتوانرێت جێبەجێ بکرێتو سودی لێببینرێت.

خاسییەتەکانی داهێنەر...

*متمانەبەخۆبوون تاوەکو پلەی خۆپەرستیو چەقبەستن بە دەوری خۆیدا، هەرچەندە لەسەر حسابی خەڵکانی تریش بێت.

*ئامانجگەلێکی ڕوونو ئاشکرایی هەیەو هەوڵدەدات بگات بە وەدیهێنانیان، هەمیشە هەموو شتێك تاقیدەکاتەوە.

*سووربوونو توانایەکی بەهێزی هەیە.

*گوێنادات بە قســەو قســەڵۆکی خراپی خەڵکانی تر، گرنگی نادات بەوەی خەڵکانی تر چۆن لێیدەڕوانن.

*لە شکســت ناترســێت، (ئەدیســۆن ٩٩٩ تاقیکردنەوەی کرد، پێش ئەوەی کە گڵۆپی کارەبایی دابهێنێت).

*حەزی لە نوێبوونەوەیەو حەز بە ڕۆتین ناکات.

*تەنها بۆ ئەوەی کە ئارەزووی دەکات بە پەرۆشە.

*ئارامو لەسەرخۆیە لە کارێکدا کە حەزی لێیەتی.

*حەزی بەجەربەزەیی و سەرکەشــییە، (ژیانی جێگیرو دوور لــە ڕووداوی کتوپــڕو سەرکەشــی ڕەنگدانــەوەی ڕێــگای ژیانێکی نەگۆڕوجێگیرە، بەڵام ناداهێنەرانەیە، ئەم شێوازە باوە لە ژیان بۆ زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵ، دادوەران، بۆ دەســەڵاتداران، هەروەها بۆ ئەوکەســانەی تریش کە کارەکانیان پێویســتیەکی زۆری بە دانایی و ژیــری هەیە زۆر گونجــاوە. لە بەرامبەردا مرۆڤــی داهێنەر کە جیاوازییەکی دەستدەکەوێت، ناکرێت سەر بەم چەشنە ژیانە بێت).

* پرسیار زۆر دەکات.

* بیروباوەڕەکانــی خــۆی لا گرنگترە، زیاتــر لەوەی گرنگی بدات بە کارکردنە سەر خەڵکانی تر.

* بەردەوامیو کۆڵنەدان (بەردەوامە لەسەر ئیشو کارەکانیو کۆڵــی لێنادات، هەروەها بە هەوڵو کۆششــێکی زۆرەوە بە شــوێن بیرۆکەکانیدا دەچێت، هەرچەندە خەڵکی تریش نەیاری بن).

*فێربوونی لە هاوڕێیەتی خەڵکییەوە پێ باشــترەو خۆی لە خوێندنەوە دەبوێرێت.

*هەمیشــە دەستپێشــخەرە کــە ئاماژەیــە بۆ ســەرکەوتنی پێشوەخت.

*ئەندێشــەی نەرمو نیانە (شــتگەلێك دەبینێت کە خەڵکانی تر نایبینن).

*هەمیشە یاوەری هاوڕێ داهێنەرانەکانی دەکات.

*هێــواشو لەســەرخۆیە لە لێکدانەوەو شــیکردنەوەی داتاو زانیارییەکاندا، بەڵام خێرایە لە گەیشتن بە چارەسەردا.

*تێکناشکێتو بەخێرایی لە کێشەکان هەڵنایەت.

*بە ئاســانی خۆیبەدەســتەوە نادات، کەللەڕەقەو بە ئاسانی دەست لە بیروبۆچونەکانی هەڵناگرێت.

مەرج نییە هەموو ئەم خەســڵەتانە لە کەســێکدا کۆببێتەوە، بەڵام هەتاوەکو ئەم خەســڵەتانە زیاد بن، ئەوا ئەو کەســە زیاتر داهێنەرە...

ئەگــەر ئەم خەســڵەتانەت تیانییە، وا گومــان نەکەیت کە تۆ داهێنەرنیت، بەڵکو دەتوانیت ئەم خەســڵەتانە وەربگریتو ببێتە خوڕەوشتێك لەلاتو ببێتە بەشێك لە ژیانت.

دەرئەنجام:

ئەگــەر باوەڕت نەکردووە کــە تۆ داهێنەریت، ئــەوا داهێنان ناکەیــت، لەبەرئەوە بڕوا بکە تۆ داهێنەریت، پاشــان ڕازی بە بە داهێنان، ئینجا داهێنان بکە.

ئەگــەر دەتەوێــت ببیتە داهێنــەر ئەوا ئــەم هۆکارانە لەوەدا یارمەتیدەرت دەبن:

* حەزو ئارەزوو.
* باوەڕو کارکردن.
* ڕوونی ئامانجەکە.
* خوێندنەوەو فێربوون.
* بیروبۆچونی خۆت بگۆڕە.
* پەلە مەکە لە ئەنجامەکانو بەردەوامبە لە سەرکەوتن.

سەرچاوە: سایتی www.altanmiya.org

# ئارامی، ناونیشانی مرۆڤی ژیرو هۆشیارە

کاتێك هیچ دەنگێك نابیستی، بیرکردنەوەت بپچڕێنێت، یان تەرکیزت نەهێڵێت، ئەو کات هەوڵبدە سوودوچێژ لە بێدەنگیو ئارامی وەربگریت، ئەوەندە تەرکیزبکە تا ئەو ساتەی گوێت لە ترپەی لێدانەکانی دڵت دەبێت، عەقڵو ژیریت لە هەموو شتێك خاوێن بکەرەوە، ئەو کات بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە تەواوی ئەو ڕۆژە بەسەرتدا تێپەڕیوە..

بێگومان بێدەنگیو ئارامی نیشانەیەکە لە نیشانەکانی سەرکەوتن، ئارامیو ئارامگرتن بەڵگەیە لەسەر کەسایەتییەکی بەهێزو پتەوو بە توانا، ئارامی ناونیشانی کەسی هۆشیارو ژیرە..

بە پێچەوانەوە، ئەو مرۆڤەی زوو هەڵدەچێت، ئەو کەسەی بە هەر هۆکارێکی بەسیتو لاوەکی توڕە دەبێت، ئەوە کەسێکی لاوازە، لاوازە لە کەسایەتیدا، لاوازە لە ژیریدا، لاوازە لە تواناو بەڕێوەبردندا..

زانایانی دەروونناسی دەڵێن:

(ئەو کەسەی بە هۆکارێکی لاوەکی توڕەدەبێت، کەسایەتییەکی لاوازی هەیە)، مرۆڤی ئارامگر، ئەو کەسەیە کە دەتوانێت سەرکەوێت بەسەر دڵی کەسانی دەوروبەریدا، هێمنیو ئارامگرتن بە تەواوی مانا، واتا بە توانا لە دروستکردنی شتە سەرسوڕهێنەرەکاندا، کاریگەر بەسەر دەروونە ڕەقو پتەوەکاندا، کەسی ئارامگر براوەی هەڵوێستو بارودۆخەکانە..

توندڕەوی، توندڕەوی دەهێنێتە بوون، توڕەبوونیش، توڕەبوون دەهێنێتە بەرهەم..

بەڵام ئارامگرتن، توڕەیی دەکوژێنێتەوە، هەروەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە.

کەواتە لە مامەڵەکردنت لەگەڵ دەوروبەرەکەت ئارامگرو لەسەرخۆبە، تەنانەت لەگەڵ خراپەکارانیشدا ڕووخۆشو لێوبەخەندەبە، بە وتەی نەرمو نیانو جوان لەگەڵیاندا بدوێ، ئەوەش خێراترینو کورتترین ڕێگەیە بۆ بەدەستهێنانی دڵانی کەسانی دەوروبەرتو سەرسامبوونیان پێت.

ئارامگربە، موعجیزات دروست دەکەیت، لە بیرت نەچێت خۆت بەرپرسی، لە چۆنییەتی مامەڵەکردنی خەڵکی لەگەڵتدا.. ئارامگرتن نیشانەی ئەوپەڕی ژیرییە، بۆ دەرکردنی گرنگترین بڕیارەکانی ژیانت بە قوڵی بیربکەرەوە، بە توانابە بۆ گەیشتن بە بڕیارە ڕاستو دروستەکان، ئەو مرۆڤەی بە سروشتی خۆی هێمنو بە ئارامە، بە ژیریو هاوسەنگی لە کەسانی دی جیادەکرێتەوە، هیوادارم بتوانینو هەوڵبدەین لە کاتی توڕەبووندا کۆنترۆڵی خۆمان بکەین، چونکە ئەو بڕیارەی لە کاتی توڕەبووندا دەدرێت، بۆ هەموو ژیانت لێی پەشیمان دەبیتەوە، هەرچەندە ڕەنگە هەندێجار بارودۆخەکە وات لێ بکات هەڵبچیتو توڕەبیت، بەڵام پێویستە ئەم هەڵوێستە لە ژیانتدا زۆر دەگمەن بێت..

ئەو کەسانەی خاوەنی دەروونێکی ئارامن، کەسایەتییەکی بەهێزیان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵنیاییەوە کەسانێك هەن خاوەنی دەروونێکی توڕەن، لە هەمان کاتدا کەسایەتیەکی بەهێزیان هەیە..

کەواتە هەمیشە لە یادت بێت، ئارامی نهێنی سەرکەوتنتە لەسەرجەم کاروبارەکانتدا..

چەندە جوانە مرۆڤ هێمنو ئارامگربێت، هەڵسوکەوتو مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا جوانو نەرمو نیان بێت، ئەو کات دەبینی دەوروبەرت بێ سنور ڕێزت دەگرنو هەڵوێستەکانت بەرز دەنرخێننو گوێڕایەڵی فەرمانەکانت دەبن، هەمیشە چاوەڕوانی کاری باشو ناوازەت لێدەکەن، مرۆڤی هێمنو ئارامگر کە لەگەڵ هەر کەسدا دابنیشێت، وا هەستدەکات لەبەردەمی مرۆڤێکی زۆر بەڕێزو بە ئەزموون دانیشتووە، کاتێك قسەی بۆ دەکەیت بە جوانی گوێت بۆدەگرێت، هەرچەندە قسەکانت دورودرێژ بێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو بارودۆخێکدا ئەو کەسەی گرەوی ژیان دەباتەوە، ئەو کەسەی سەردەکەوێت، ئەو کەسەی سوود وەردەگرێت، ئەو کەسەی بەختەوەر دەبێت، ئەو کەسەی لە بڕیارەکانی پەشیمان نابێتەوە، ئەو کەسەیە کە هێمنو لەسەرخۆو بە ئارامە..

بەرزان ئەبوبەکر





# پاداشتر بەخشین!

لەســەردەمێکی نەبوونو کەم دەســتیدا، ڕۆژێك ئافرەتێکی هــەژار کە چەند منداڵێکــی هەتیوی دەبێت، ئــەدا لەدەرگای پیاوچاکێــك، بــە ئومێــدی ئــەوەی یارمەتییەکــی بــدات، خزمەتکارەکــەی دەرگای لێدەکاتەوەو پێی دەڵێ: فەرموو چیت دەوێت؟ ئافرەتەکە دەڵێت: نەبوونو لێقەوماوو هەژارم، بە خاوەن ماڵەکــەت بڵێ یارمەتییەکم بدات، تــا ئەو هەتیوانەم تێربکەم، ئەویــش بە پیــاو چاکەکە دەڵێت، کە ئافرەتێکی بەو شــێوەیە هاتووەو داوای یارمەتی دەکات، پیاوچاکەکەش بە خزمەتکارەکە دەڵــێ: چیمان هەیە لە ماڵەوە؟ خزمەتکارەکەی دەڵێ: تەنها ١٠ هێلکەمــان هەیە، ئەویش دەڵێ: بچــۆ هەر١٠ هێلکەکەی بدەرێ، خزمەتکارەکــەش دەڵێ: ئــەی بۆ ئێوارە خۆمــان چی بخۆین؟ پیــاو چاکەکەش پێی دەڵــێ: زوو بڕۆ بیدەرێ، خــوا گەورەیە تــا ئێوارە شــتێك هەر دەبــێ بیخۆین؟ کاتێــك خزمەتکارەکە هێلکــەکان دەبات بــۆ هەژارەکە یەك هێلکەی لێ دەشــارێتەوە بــۆ خــۆیو بە خۆی دەڵێ با ئەمشــەو نەمرم لە برســان، ئەم تاکــە هێلکەیە دەخۆم، نۆ هێلکەی دەدات بە ئافرەتە هەژارەکە، ئێــوارە نزیکبووەوەو خەریکبوو تاریکی دادەهات، خزمەتکارەکە دڵخۆشــبوو، چونکە ئەمشەو شــتێك هەیە بیخوات، لە ناکاو لە دەرگای مــاڵ درا، کاتێك خزمەتکارەکە دەرگای ماڵەکەی کردەوە بینی وا دراوســێ دەوڵەمەندەکەیان، (٩٠) هێلکەی بە دیاری بۆ هێناون، خزمەتکارەکە لێی وەرگرتو بردییە لای پیاوچاکەکەو وتــی: دراوســێ دەوڵەمەندەکەمان ئەم هێلکانــەی بە دیاری بۆ ناردوویــن، ئەویــش پێی دەڵێــت: بیانژمێرە بزانــە چەندن؟ کاتێك خزمەتکارەکە لە ژماردنیان دەبێتەوە دەڵێ: قوربان (٩٠) هێلکەیە، پاشان پیاوچاکەکە ڕووی تێدەکاتو پێی دەڵێ: ئایا تۆ کاتێك ئەو هێلکانــەت دا بەو ئافرەتە هەژارە چەند دانەبوون؟ هیچت لێ دەرهێنا؟ خزمەتکارەکە لە شــەرمو تەریق بوونەوەدا ســەری دانەواندو پاشــان وتی: بمبورە، یەك هێلکەم لێدەرهێنا وتم: با لە برســا نەمرم، ئەمشــەو بیخۆم پیاوچاکەکەش وتی: زانیــم، چونکە خوای گەورە وەڵامــی چاکە (١ بە ١٠) دەداتەوە، ئێمە (٩) هێلکەمان بەخشی، ئێستاش خوای گەورە (٩٠) هێلکەی پێبەخشین، ئەگەر هەر (١٠) هێلکەکەت ببەخشیایە ئێستا (١٠٠) دانە هێلکەمان پێدەبەخشرا.

لەم چیرۆکەوە تێدەگەین کە خوای گەورە، بە (١٠) ئەوەندە پاداشــتی ئەو کەســانە دەداتەوە یارمەتیدانی نەدارانو هەژاران دەدەنو لە پێناوی ئەودا دەبەخشن.

ئا. بەهەشت عەلی



محەممەد عەبدوڵا/ چۆمان

# با لە هەموو شتێکدا..
# دیوە جوانەکانی بخوێنینەوە..

هەرکاتێک لە قورئانی پیرۆزدا بەسەر ئەم ئایەتەی خوای باڵادەست ڕادەگەم کە دەفەرموویێت: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ﴾ دێمە سەر ئەو باوەڕەی کە بەڕاستی ئێمەی مرۆڤ زۆر سەرکەش‌و بێ هزرین، بە تایبەت لەو ساتانەی نەهامەتییەک ڕوومان تێدەکات، ئەوەی چاکەیە کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوین لەبیرمان دەچێت‌و هەرچی گومانی خراپ هەیە بە خەیاڵماندا دێت‌و تووشی پشێوییەکی دەروونی وەها دەبین، کەوا ئەمسەرو ئەوسەری دیار نەبێت، لە بیرمان نامێنێت ئەگەر نازو نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بەسەر خۆماندا بژمێرین، نایەنە ژماردن، هەروەک خۆی فەرموویەتی لە ئایەتەکەدا.

بە بۆچوونی خۆم، خوای باڵا دەست‌و کارزان هیچ کاری بەوە نییە کە ئێمە بێین ڕۆژانە نیعمەتەکانی کە پێی بەخشیوین بیانژمێرین، بەڵکو دیوێکی تری ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆ ئەوە دابەزیووە کە بیکەین بە پێوەر بۆ هەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانەمان لەگەڵ ژینگەو دەوروبەرماندا، وەک ئەوەی خوای گەورە بیەوێت فێرمان بکات کە لە هەر هەڵوەستەیەکی ژیانماندا فێربین زوو دیوە جوانەکەی بخوێنینەوەو بیری لێبکەینەوە، بۆ نموونە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەر لەناو بازنەی خێزانی خۆماندا کە زۆرترین کاتەکانی ژیانمانی تێدا بەسەردەبەین، ئەگەر ڕۆژێک هەڵسوکەوتێکی هاوسەرت بە دڵ نەبوو، زوو پەنا بەرە بەر دیوە جوانەکانی هاوسەرەکەت‌و بیری لێ بکەرەوە، ئەوە کە دایکی جگەرگۆشەکانت‌و دڵسۆزانە خزمەتیان دەکات، بەس نییە ئەو بۆتە سەبووری ڕۆحی شەکەتت لە کاتی گەڕانەوەت بۆماڵەوە، بەس نییە ئەو پارێزەری حەیاو حورمەتی تۆیە لە ژیانتدا؟ ئەی هەر ئەو نییە بە بێ گوێدانە ماندووبوون‌و منەتکردن، هەموو کاروبارەکانی ماڵەوە ڕایی دەکات؟ شووشتن‌و ئوتووکردن‌و پاککردنەوەی ماڵ ..هتد، ئەی بەس نییە ئەو شەوە کە تۆ نەخۆش کەوتیت‌و ئازارت هەبوو، ئەو ئازارەکانی لەگەڵ بەش کردی‌و تا بەرەبەیان خەو نەچۆتە چاوەکانی، باشە بێ مروەتی‌و سپڵەیی نییە ئەگەر ڕۆژێک شتێکت بە دڵ نەبوو، هەموو ئەمانە لە بیرکەی‌و وابزانی ئەوەی خۆشییە لەم هاوسەرەت نەدیووە، بەهەمان شێوە لەگەڵ هاوڕێ گیانی بەگیانیەکەت، کاتێک دڵت گەرد دەکات بەرامبەری، ئەم هەموو تەمەنە جوان‌و پڕ یادگاری هاوڕێکەت لە بیربکەی، زوو زوو دەنگی لێ داببڕیت، یان با باسی ئەو گەنجە بکەین کە تازە پێدەگات‌و وا دەزانێت هەر لە خۆیەوە ئەو جوانی‌و شان‌و شەوکەتەی بۆ دروستبووە، کاتێک ئاکارێکی دایک‌و باوکی بە دڵ نابێت، دەنگیان بەسەرا بەرزدەکاتەوەو هاوار دەکات، بیری چووە کە ئەو ساتەوەختێک بووە ئەگەر ئەوان نەبوونایە تەنانەت قومێک ئاویشی بۆ نەدەخورا، بیری چووە ئەو هەموو سۆزو میهرەبانیەی بەسەریا ڕژاوە تاکو گەیشتۆتە ئەو تەمەنە، بیری چووە شەوانە چەندجار دایکی لە شیرینی خەوا بێدارکردۆتەوە... بیری چوو... بیری چوو.

کەواتە باهەموومان فێربین‌و خۆمان ڕابهێنین لە نەهامەتییەکاندا دیوەجوانەکان بخوێنینەوە، تاکو ژیان بە جوانی‌و گەشی ببینین.



پەیام



# زیرەکی باڵوڵ!

یەکێك لە نەریتی پاشاکان لە ڕابردوو ئێستادا، ئەوەیە ئەگەر بیانەوێت کۆبوونەوەیەك لەگەڵ وەزیرو داروودەستەکەیان، یان کەسانی بە ئەزموونو داناو زانای شارو وڵاتەکەیان ساز بکەن، ئەوا لە دوای هەمووان دەچنە هۆڵی کۆبوونەوەکە، بۆئەوەی کاتێك پاشا دەچێتە نێو هۆڵی کۆبوونەوەکە، هەمووان بۆ بە گەورەزانینو ڕێزگرتنو شکۆداری لەبەری هەڵسن، نەك ئەم پێشتر ئامادەبێو لەبەر کەسە بە تەمەنو نزیکەکانی هەڵسێت..

ڕۆژێکیان هارونە رەشید بە مەبەستی کۆبوونەوە لەگەڵ کەسانی ژیرو خاوەن ئەزموون، دەڕوات بۆ هۆڵی کۆبوونەوە، هەروەکو نەریتی هەمیشەیی دوای هەمووان بە ڕێکەوت بۆ هۆڵی کۆبوونەوەکە، بەڵام شتێکی سەیر ڕووی دا، کاتێك خەلیفە هاروون گەیشتە هۆڵی کۆبوونەوەکە، پێش ئەوەی دابنیشێت، باڵوڵ هەستاو چووە سەر کورسییەکەی، دیمەنەکە زۆر سەرنجڕاکێش بوو، خەلیفە هاروون ڕاوەستاوەو باڵوڵ لە شوێنەکەیدا دانیشتووە!!

دەستبەجێ پاسەوانەکانی باڵوڵیان گرتو لەبەردەمی خەلیفەو هەموو ئامادەبووان بە قامچیو شەقو بۆکز دەستیان بە لێدانی کرد.. باڵوڵ دەستیکردە گریانو هاوارکردنو پاڕانەوە..

پاش ماوەیەك لە لێدانو سزادان، خەلیفە هاروون فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد کە کە دەست ڕاگرن..

خەلیفە هاروون بە باڵوڵی گوت: ئایا سزاو لێدانو قامچییەکان، ئازاریان پێگەیاندیت؟

باڵوڵی ژیرو دانا، لە وەڵامدا وتی: نەخێر!!!

خەلیفە هاروون وتی: ئەگەر ئازارت نەبوو، ئەو هاوارو گریانو شیوەنەت لە چی بوو؟

باڵوڵی زانا وتی: لە ڕاستیدا بۆ تۆ گریام، بۆ حاڵی تۆ هاوارم دەکرد، بەزەییم بە تۆدا دەهاتەوە، فرمێسکم بۆ تۆ هەڵدەوەراند، دڵنیابە گریانو هاوارکردنو شیوەنەکەم بۆ خۆم نەبوو، بەڵکو بۆ تۆبوو!

خەلیفە هاروون بەسەرسوڕمانەوە وتی: چۆن بۆ من گریایت، لە کاتێکدا قامچیو لێدانەکان بەر جەستەی تۆ دەکەوتن، هاوارو ناڵەو گریانیش هەر لە سنگی تۆوە دەردەچوو؟

باڵوڵی فەیلەسوف وتی: من کەمتر لە یەك خولەك لەسەر ئەو کورسییە دانیشتم، لەلایەن پاسەوانو سەربازەکانی تۆوە، دووچاری ئەو هەموو قامچیو لێدانو سزاو ئازارە بوومەوە، بە جۆرێك کە هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە ئازارم پێنەگەیشتووە، خۆ ئەگەر تۆ فەرمانت نەکردایە دەست لە لێدانو سزادانم هەڵگرن، ئەوە دەستیان هەڵنەدەگرت!!

باشە ئەگەر من بۆ تەنها خولەکێك ئەوە سزاکەم بێت، ئەی تۆ کە چەندین ساڵە لەسەر ئەو کورسییە دانیشتووی، دەبێت لێدانو سزای تۆ چۆن بێت، لەلایەن فریشتەو پاسەوانەکانی دۆزەخەوە؟ ئەو کاتەی لە تۆ دەدرێت، کەسیش ناڵێت دەست هەڵگرنو ئیتر بەسییەتی!!

لەبەرئەوە کاتێك بیرم لە حاڵی تۆ کردەوە، بۆ تۆ دەستم بە گریانو هاوار کرد!!

فەرمان کرا، کە ئامادەبووان پەندو کەڵك، لە وتەو کردەوەو هەڵوێستە ناوازەو نادرەکانو دانایی باڵوڵی زانا، وەربگرن، ئەوەی لە هەمووی سەیرتر بوو ئەوەبوو، کە باڵوڵی دانا هەر کارێکی دەکرد، سەرەتا خەڵکی بە کارێکی سادەو شێتانەیان دەزانی، بەڵام پاش لێکدانەوەی دەردەکەوت کە هەموو هەڵوێستەکانی لێوان لێون لە پەندو ئامۆژگاری، بۆ دنیاو دوارۆژ!!




# کەس تەمەنی بەفیرۆ ناڕوات، بەڵام!

گومان لەوەدانییە لەسەر ئەم هەسارەی خۆمان کە ناوی زەوییە بەڕێزترینو گرنگترین بونەوەر مرۆڤە، لە ناو مرۆڤەکانیشدا هەر کەس بۆ خۆی لە هەموو مرۆڤەکانی تر لە پێشترە بۆئەوەی گرنگی بە کەسایەتی خۆی بداتو لە خەمیدا بێتو بیپارێزێو پەروەردەی بکاتو لە هەوڵی پێگەیاندنیدا بێت.

مرۆڤەکان بە شێوەیەکی گشتی، کەس تەمەنی بە فیرۆناڕوات، بەڵام هەر کەس تەمەنی لە کارێکدا سەرف دەکات، جا ئەگەر ئەو کارە بە نرخ بێتو داهاتووی پرشنگدار بێت، ئەوە ئێمە دەڵێین ئەو کەسە بە شێوەیەکی ڕێکو پێکو جوان، سودی لە تەمەنی خۆی وەرگرتووەو تەمەنی بە فیرۆ نەچووە، بەڵام ئەگەر ئەو کارەی تەمەنی بۆ سەرف دەکات بە نرخ نەبێتو کەم بایەخ بێت، ئەوە ئێمە دەڵێین: تەمەنی بە فیرۆ داوە، واتە بە فیرۆدانی تەمەن پەیوەستە بەو شتەوە کە لە پێناویدا سەرفی دەکەین.

لێرەوە ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجام گیرییەی کە زۆر گرنگە مرۆڤ بزانێت تەمەنی لە چ کارێکدا سەرف دەکات، بۆیە لەو دووڕیانانەی کە لە تەمەنماندا دێتە ڕێمان، زۆر بە وردیو بە وریاییەوە دەبێت بڕیار بدەین، چونکە بۆ نموونە ئەگەر بڕیارماندا بخوێنین، ئەوە تەمەنمان لە خوێندندا سەرف دەکەین، بەڵام ئەگەر بڕیارمان دا نەخوێنینو بازرگانی بکەین، تەمەنمان لە بازرگانیدا سەرف دەکەین، بە هەمان شێوە بۆ هەموو ئەو کارو کایە جیاوازانەی لە تەواوی تەمەنماندا دێتە ڕێمان.

کەواتە بۆئەوەی مرۆڤ تەمەنی بە فیرۆ نەڕواتو داهاتووی پرشنگدار بێت، دەبێت ئاگامان لەو بڕیارانە بێت کە لە تەمەنماندا دەیاندەین، بۆئەوەی بڕیاری دروستو بەجێ بدەینو لە داهاتوودا لێی پەشیمان نەبین، چونکە ئەگەر تەمەن ڕۆیی، ئیدی پەشیمانی دادی کەس ناداتو سود بە کەس ناگەیەنێت.

من لێرەدا دوو خاڵ دەخەمە ڕوو، بۆئەوەی بتوانین بڕیاری ڕاستو دروست بۆ داهاتووی تەمەنمان بدەین، چونکە داهاتوومان بەرهەمی بڕیارەکانی ئێستامانە.

یەکەم: سودوەرگرتن لە ئەزمونی ئەو کەسانەی لە دەوروپشتمانن: چونکە ئەوان ئەو قۆناغەی ئێمەیان بە کردەوە تێپەڕاندووە، بۆیە پرسو ڕا بە ئەوانو ڕاوێژکردن پێیان، ئێمە لە زۆر هەڵەو کەمو کوڕی دووردەخاتەوە، لە بارەی گرنگی ئەزموونەوە وتراوە خۆزگە مرۆڤ دوو جار لە دونیادا بژیایە، یەکەمیان ئەزمونی کۆبکردایەتەوەو لە دووەمیشیان سودی لەو ئەزمونانە وەرگرتایە.

دووەم: خوێندنەوە: وتراوە تەنها ئەو مرۆڤانە دەتوانن لە تەمەنی خۆیان زیاتر بژین کە دەخوێننەوە، خوێندنەوە وا لە ئێمە دەکات بزانین لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا، لەم سەر زەوییە چی ڕووی داوە، یان هەر ساتو کاتێکی تر. بێگومان هەر کەسیش زیاتر بژی ئەزمونی زۆرترو باشتر کۆ دەکاتەوە، هەر کەسیش ئەزمونی زۆر بێت لە ژیاندا بڕیاری دروستو بە جێ دەردەکات.

# نهێنییەکانی سەرکەوتن

مەهناز عەزیز




سـەرکەوتن: یەکێکە لە هۆکارە سـەرەکییەکانی بەختەوەری، کە هیچ کەسـێك نییە حەزی پێنەکات، بەڵام بوون بە کەسـێکی بەختەوەرو سەرکەوتوو، پێویستی بە هەوڵو کۆششێکی بەردەوامە، پێویستە بگەڕێیـن بەدوای وەڵامی ئەو پرسـیارەی کە لەبەرچی هەندێـك کەس سـەرکەوتوو بەختەوەرن لە ژیانـدا، هەندێکیش هەمیشە دۆڕاوو شکستخواردوون؟

بێگومـان هۆکارگەلێك هەن کە ئـەم جیاوازیانەی خوڵقاندووە لە نێوان کەسـەکاندا، بۆ بوون بە کەسـێکی سەرکەوتوو بەختەوەر پێویسـتە هەموو ئەو هۆکارانە بدۆزینەوە کە دەتوانێت بمانکات بە کەسێکی بەختەوەرو سەرکەوتوو، یان دۆڕاوو شکستخواردوو لە ژیاندا، بە دۆزینەوەی ئەو هۆکارانە دەتوانین سوود لە هەڵەی کەسانی دۆڕاو وەربگرین، بە شـوێن پێی سەرکەوتووەکاندا سەربکەوین. دە بەندی ڕێنیشاندەر بۆ سەرکەوتنو دوورکەوتنەوە لە شکست:

- کەسانی سەرکەوتوو: هیچ کات لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی هیواو ئامانجەکانیان ماندوونابن، وەك: تۆماس ئەدیسۆن کە (٩٩٩) جار شکستی هێنا، بەڵام ئەو ناوی دەنا هەنگاوێکی تر بۆ سەرکەوتن، کە لە ئەنجامدا گەیشـتە ئامانجەکەی، بەڵام کەسانی دۆڕاو کە لە یەکەم هەنگاودا سەرنەکەون، ئیتر واز لە ئامانجەکانیان دێنن.

- کەسـانی سـەرکەوتوو: هەمیشـە خۆیـان دەپارێـزن لەو هۆکارانەی کـە بیروباوەڕی نەرێنی بـۆ دەخوڵقێنێت، بۆ نمونە: «تۆ ناتوانیت ئەمە بکەیت»، کە بەڕاسـتی ئەمە دەسـتەواژەیەکی ڕوخێنەرە کە لە لایەن هەرکەسێکەوە پێی بوترێت، بەڵام کەسانی دۆڕاو خۆیان ئەم بیروڕایە بۆ خۆیان دروستدەکەن.

- کەسانی سەرکەوتوو: هەمیشە سوود لە ئەزمونەکانی خۆیانو کەسـانی دۆڕاو وەردەگرن، هەتا هەمان هەڵـە دووپات نەکەنەوە، بەڵام کەسانی دۆڕاو زۆر کات هەڵەی پێشوو تر ئەنجامدەدەن.

- کەسـانی سەرکەوتوو: هەمیشە خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر بە هەڵەو کەموکورتییەکانیان، هەوڵی چارەسـەرکردنیان دەدەنو لۆمەی کەسانی دەوروبەریان ناکەنو کەس بەتاوانبار نازانن، بەڵام کەسـانی دۆڕاو هەمیشە کەسـانی تر تاوانبار دەکەنو لۆمەی کەسانی دەوروبەر دەکەن، هەرچەندە کەموکورتی لە خۆیانەوە بێت.

- کەسانی سەرکەوتوو: هەمیشە نەخشە بۆ ژیان دەکێشن، هیچ کات بێبەرنامەنین، کاتێـك ئامانجێکیان هەبێت ئەوا بێگومان بە وردی بەرنامەڕێژی بۆ دەکەن، هەرگیز متمانەیان لە دەسـتنادەن ئەگـەر نەخشـەکەیان سـەرکەوتوو نەبێـت، بەڵکو هەمیشـە بە نەخشـەیەکی نوێ دەسـتبەکار دەبنەوە، بـەڵام دۆڕاوەکان تەواو پێچەوانەن.

- کەسانی سەرکەوتوو: بڕوابەخۆبوونو متمانەیەکی بەهێزیان بـە خودی خۆیان هەیە کە دەبێتە پاڵنەرێکی موعجیزە ئاسـا بۆ سـەرکەوتنیان، بەڵام کەسە دۆڕاوەکان لە یەکەم هەنگاوی شکستدا دەڕووخێنو متمانەیان لە دەست دەدەن.

- کەسـانی سـەرکەوتوو: گرنگییەکی ئەوتۆ بـە کات دەدەن، هەمیشـە کاتەکانیـان دابەشـدەکەنو ڕێکـی دەخـەن، کات بـۆ کەسـانی دەوروبەریـان دابیندەکـەن، هیچ شـتێك دواناخەنو لە کاتی دیاریکـراوی خۆیدا کارەکانیان ئەنجام دەدەن، بەڵام کەسـە دۆڕاوەکان هەرگیـز نـرخو بەهای کات نازانن، هـەردەم کاتیان بۆ کەسانی دەوروبەریان نییە، هەمیشە دەڵێن: «ئەمڕۆ نا سبەی» بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان.

- کەسـانی سـەرکەوتوو: هەمیشـە بڕوایان بە سەرکەوتنیان هەیەو ترسـی نابەجێ لە ڕیشـە دەردێنن، بەڵام کەسە دۆڕاوەکان ترس بە سەریاندا زاڵە، ترسی سەرنەکەوتنیان هەیە، هەرگیز لەو بڕوایەدا نین کە سەردەکەون.

- کەسانی سەرکەوتوو: ئامانجەکانیان بە ئەندێشە وێنادەکەن، هەمیشـە گەشبینو بۆشتە باشەکان دەڕوانن، بەڵام دۆڕاو هەردەم ڕەشبینەو لێکدانەوەی خراپ بۆ بەدەستهێنانی هیواو ئامانجەکانی دەکات.

- کەسـانی سـەرکەوتوو: دەستەواژەی دروسـتکەر بەکاردێنن وەك: «مـن دەتوانم هەموو کارێك بکەم کـە بمەوێت»، هەردەم بەردەوامن لـە هەوڵەکانیان، بەڵام دۆڕاوەکان تـەواو پێچەوانەن، هەمیشە خۆ ڕووخێنەرن، لەبەرئەوە زوو شکستدەهێنن.



# هەڵسەنگاندنی کەسایەتیت..

ئەم تاقیکردنەوەیە ئەگەر چی نامۆیە، بەڵام بەسوودەو لایەنەکانی کەسایەتیت بۆ ئاشکرا دەکات، هیوادارم کاتێکی خۆشی لەگەڵدا بەسەربەرن، وەڵامی گونجاو بە پێی بیرکردنەوەی خەیاڵی خۆت بۆ هەر پرسیارێك هەڵبژێرە، باشتر وایە پەڕاوو پێنوسێکت بە دەستەوە بێت:

١- تۆ لە گەشتەکەتدا دەگەیتە دارستانێکی چڕو تاریك، لە نێودارستانەکەدا کوخێکی کۆن دەبینیت:

١- دەرگای کوخەکە چۆنە؟

أ- کراوەتەوە. ب- داخراوە.

٢- کاتێك دەچیتە نێو کوخەکەوە، مێزێك دەبینیت: شێوەی ئەو مێزە چۆنە؟

أ- بازنەیی. ب- هێلکەیی. ج- چوارگۆشەیی. د- لاکێشەیی. هـ- سێگۆشەیی.

٣- لەسەر مێزەکە گوڵدانێك دانراوە، لە ناو گوڵدانەکەشدا ئاو هەیە: ئەندازەی ئەو ئاوەی لە ناو گوڵدانەکەدایە چەندە؟

أ- پڕ. ب- نیوە. ج- بەتاڵ.

٤- ئایا گوڵدانەکە لە چی دروستکراوە؟

أ- شوشە. ب- پۆرسلین. ج- قوڕی سورەوەکراو. د- کانزا. هـ- پلاستیك. و- دار.

٥- کاتێك لە کوخەکە دێیتە دەرەوە، لە گەشتەکەت بە نێو دارستانە تاریکو چڕەکەدا بەردەوام دەبیت، تا دەگەیتە لای تاڤگەیەك.. ئەندازەی خێرایی ئاوی تاڤگەکە چەندە؟

لە سفرەوە تا ژمارە (١٠) ژمارەیەك هەڵبژێرە..

٦- دوای ئەوەی تاڤگەکەت بەجێهێشت، پێت لە شتێکی ڕەق هەڵکەوت، سەیر دەکەیت شتێکە دەبریقێنێتەوە، دادێیتەوە بۆئەوەی هەڵی بگریتەوە، دەبینیت دەستەیەك کلیلە، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، ژمارەی کلیلەکان چەندە؟

لە سفرەوە تا ژمارە (١٠) ژمارەیەك هەڵبژێرە.

٧- دووبارە دەستدەکەیتەوە بە ڕۆیشتن، بە مەبەستی دەرچوون لە دارستانەکە، لە ناکاو لە بەرزییەکەوە دەخلیسکێیت بۆ خوارەوە لە نێو پوشو پەڵاشێکی زۆردا کۆشکێك بەدی دەکەیت، کۆشکەکە چۆنە؟

أ- کۆنە. ب- نوێیە.

٨- دەچیتە نێو کۆشکەکەوە، لە ناوەڕاستی ئەو کۆشکەدا گۆمە ئاوێکی بچکۆلە هەیە، لە دەوری گۆمە ئاوەکە چەندین پارچە گەوهەری لێیە، ئایا پارچە گەوهەرەکان هەڵدەگریتەوە؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر.

٩- لە تەنیشتی ئەو گۆمە ئاوەوە، گۆمێکی تری ئاو هەیە،

بەڵام ئاوەکەی پاکو بێگەردو سازگارە، لەسەر ئاوەکە چەند دراوێك هەیە، ئایا دراوەکان هەڵدەگریتەوە؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر.

١٠- لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبیت، تا کۆتایی کۆشکە گەورەکە، تا دەروازەیـەك دەدۆزیتەوە لەوێوە دەچیتە دەرەوە، دەگەیتە باخچەیەك پڕ لە سـەوزایی، صندوقێك لە نێو باخچەکەدایە، لەو باوەڕەدایت قەبارەی صندوقەکە چۆن بێت؟

أ- بچووك. ب- مامناوەند. ج- گەورە.

١١- ئایا صندوقەکە لە چی دروستکراوە؟

أ- پارچە مقەبا. ب- کاغەز. ج- دار. د- کانزا.

١٢- لـە لایەکـی باخچەکـەوە پردێـك هەیـە، دوور لە صندوقەکە، ئایا ئەو پردە لە چی دروستکراوە؟

أ- کانزا. ب- دار. ج- حەیزەران.

١٣- لە بەرامبەر پردەکە، ئەسپێکی لێیە، ڕەنگی ئەسپەکە چۆنە؟

أ- سپی. ب- خۆڵەمێشی. ج- قاوەیی. د- ڕەش.

١٤- ئەسپەکە چی دەکات؟

أ- ئارامو لەسەرخۆیەو لە شوێنی خۆی ڕاوەستاوە.

ب- دەلەوەڕێت. ج- بە چواردەوری باخەکەدا غار دەدات.

١٥- گەردەلولێـك لـە دوورەوە بـەرەو ڕووت دێت، سـێ هەڵبژاردنت لەبەردەمدایە؟

أ- ڕادەکەیتو لە صندوقەکەدا خۆت دەشاریتەوە.

ب- ڕادەکەیـتو لە ژێر پردەکەدا خۆت حەشـار دەدەیت.

ج- ڕادەکەیتە سەر پشتی ئەسپەکەو بە غار دوور دەکەویتەوە.

بەرموون بۆ هەڵسەنگاندنی وەڵامەکان:

١- أ- دەرگای کراوە، واتە تۆ کەسێکی ئامادەی بۆ هاوکاریو یارمەتیدان.

ب- دەرگای داخـراو: تۆ کەسـێکی تەنهـا پارێزگاری لەو شتانە دەکەیت کە تایبەتن بە خۆتەوە.

٢- مێـزی بازنەیـیو هێلکەیی: پارێزگاری لە سـەرجەم هاوڕێکانت دەکەیتو متمانەت پێیان هەیە.

ب- مێزی چوارگۆشـەو لاکێشـەیی: تۆ زۆر وردەکاری لە هەڵبژاردنی هاوڕێکانتدا، هاوڕێیەتی کەسانێك دەکەیت کە لە خۆت دەچن.

ج- مێـزی سێگۆشـە: تـۆ بـۆ هەڵبژاردنـی هاوڕێکانت مەرجداری، لە ژیانتدا هاوڕێی زۆریشت نییە.

٣- أ-گوڵدانی بەتاڵ: پێداویستییەکانی ژیانت تەواوو نییە.

ب- گوڵدانـی نیـوە پڕ: ئـەوەی لە ژیانتـدا بوویتە خاوەنی نیوەی ئاواتو هیواکانتە.

ج- پەرداخی پڕ: ژیانت دەسـتەبەرو تەواوەو تۆ لە ژیانو گوزەرانت ڕازیت.

٤- شوشـە، پۆرسـلین، ج- قـوڕی سـورەوەکراو: تـۆ لە کۆنترۆڵو بەڕێوەبردنی ژیانتدا کەسێکی لاوازیت.

ب- کانـزا، پلاسـتیك، دار: تـۆ کەسـێکی بەهێـزی لـە بەڕێوەبردنی ژیانتدا.

٥- أ- سفر: لە ژیانتدا حەزت لە سۆزداری نییە.

ب- ١-٤: حەزکردنت لە سۆزو خۆشەویستی لاوازە.

ج- ٥: حەزکردنت لە سۆزداری شێوەیەکی ئاسایی هەیە.

د- ٦-١٠: تۆ کەسێکی زۆر زۆر سۆزداریت.

٦- سفر- ١: تۆ تەنها هاوڕێیەکی ڕاستەقینەت هەیە.

ب- ٢-٥: تۆ هاوڕێ ڕاستەقینەکانت زۆر کەمن.

ج- ٦-١٠: تۆ هاوڕێ باشو چاکەکانت زۆرن.

٧- کۆشکی کۆن: پەیوەندییە کۆنەکانت شکستخواردوو بە ئازارن.

ب-نوێ: پەیوەندییە پێشینەکانت زۆر باشو سەرکەوتووە.

٨- بەڵـێ: تـۆ دوودڵ نیـت لـە قسـەی خۆشکردن بۆ بەدەوروبەرت، لە کاتێکدا هاوبەشی ژیانیشت لەگەڵتدایە..

نەخێر: تۆ کەسێکی قسەخۆشو موجامیل نیت..

٩- أ- بەڵـێ: تـۆ دوودڵ نیت لە قسـەی خۆشـکردن بۆ بەدەوروبـەرت، بـەڵام کاتێك کە هاوبەشـی ژیانت لێت دیار نییە. ب- نەخێر: تۆ کەسێکی بە وەفایت.

١٠- صندوقێکی قەبارە بچووك: هەستت دەربارەی خۆت لاوازە.

صندوقی قەبارە مامناوەند: هەسـتت سەبارەت بە خۆت، ئاساییو مامناوەندییە.

صندوقی قەبارە گەورە، هەستت بەرامبەر خۆت بەهێزو پتەوە.

١١- پارچە مقەبا، کاغەز، دار: تۆ کەسێکی خۆبەکەمزانی.

کانزا: تۆ کەسێکی کەللە ڕەقو سەرکەشی بەرامبەر بە خۆت.

١٢- کانزا: پەیوەندییەکی پتەوت هەیە لەگەڵ هاوڕێکانت.

دار: پەیوەندییەکی ئاساییت هەیە لەگەڵ هاوڕێکانت.

حەیزەران: پەیوەندیت باش نییە لەگەڵ هاوڕێکانت.

١٣- ئەسـپی سـپی: هاوبەشـی ژیانت لەبـەر دیدی خۆت کەسێکی باشو چاکو تێگەیشتووە.

ئەسـپی خۆڵەمێشـیو قاوەیی: تێڕوانینت بۆ هاوبەشـی ژیانت، تێڕوانینێکی ئاساییە.

ئەسـپی ڕەش: باش سـەیری هاوبەشـی ژینـت ناکەیت، ئەوەش نیشانەیەکی خراپە.

١٤- دامەزراوو ئارام، دەلەوەڕێت: هاوبەشی ژیانت کەسێکی ئارامو خۆبەکەمزانەوماڵداریت بۆ دەکات.

غاردان بە چواردەوری باخەکەدا: هاوبەشی ژینت کەسێکی سەرکەشو جەربەزەو چاونەترسە.

١٥- کۆتا خاڵو گرنگترین خاڵی هەڵسەنگاندنەکە:

گەردەلول: گرفتەکانی ژیانتە.

صندوق: تۆیت.

پرد: هاوڕێکانتە.

ئەسپ: هاوبەشی ژیانتە.

کامیان هەڵدەبژێریت؟

ئەگـەر صندوقەکـەت هەڵبـژارد: تـۆ پارێـزگاری لە هەستەکانتو گرفتەکانتو ئازارەکانی خۆت دەکەیت.

ئەگـەر پردت هەڵبژارد: هاوڕێکانت ئەو کەسـانەن کە چواردەوریـان داویـت، لە کاتـی ناڕەحەتیـدا پەنایان بۆ دەبەیت.

بەڵام ئەگەر ئەسپت هەڵبژارد: تۆ بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکانت، پەنا دەبەیتە بەر هاوبەشـی ژیانت، بۆئەوەی چارەسەرو ئاسوودەییت دەستبکەوێت.

# تاكو ئایدۆلۆژیای کۆمەڵایەتی

بەڵێن ئەنوەر

هەمووم‌ـــان زۆرجار لە ژیانـــدا حاڵەتگەلێکی ڕۆحی باش، یان خراپمان هەســـتپێکردووە، تەنانەت لەو کاتانەشـــی کە لە حاڵەتی جوڵەداین « ئارامگرتنمان ئەزمونکردووە، هەندێجار کاتژمێرەکان، هەفتـــەکان، یـــان تەنانـــەت کاتێکـــی زیاترمـــان لـــەم دۆخـــەدا بەســـەربردووە، بەڵام لەوانەیە هیچ کاتێك لە خۆمان نەپرسیبێت ئاخۆ دەبێت شـــوێنی هەڵگرتنی ئەم پێکدادانو ڕاســـتیانە لە کوێ بێـــت؟! تەنانەت هەندێجار لە دەرەوەی جەســـتەی خۆمان بەدوای هۆکاری ئـــەو دەردەدا گەڕاوینو وەڵاممان لە چواردەورو تاکەکانی دەوروپشـــتمان بەدەستهێناوە، ئەمە لە کاتێکدا وەڵامی ڕاستەقینەو دروست، لە ناو دەزگای بیرکردنەوەی خۆماندایەو دەبێتە پاشکۆی بەش بە بەشی دۆخە جیاوازەکانی ئایدۆلۆژیمان»!

جۆرو شـــێوازی بیرکردنەوەکان لە هەمـــوو کاتێکدا فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ بەدیهێنانی خۆشییەکانو خەمەکان. دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم کە ئەگەر بتوانین بەسەر بیرکردنەوەکانی خۆماندا زاڵ بیـــن، ئەو کاتە ئەوە ئێمەین کە دەبینە بنیادو دامەزرێنەری بینای ڕۆحو بڕیار بەدەســـتی ئـــەو بارودۆخە تونـــدو ئاڵۆزانەی لە ژیاندا ڕووبەڕووم‌ـــان دەبنـــەوەو دواتر دەتوانین شـــوێنگەیەك بۆ خۆمان دیاریبکەینو بە تەواوی خۆمان خاڵی بکەینەوە لەو قەیدو بەندانەی کە خۆمان توشـــی خۆمان کـــردووە. ئەگەر بێـــتو بیرکردنەوەکان بەســـەر ئێمەدا زاڵبـــوون» ئەو کاتە بە ئاســـانی عەقڵمان کەلەبچە دەکاتو بۆ هەر شـــوێنێك ئارەزوو بکات کێشـــماندەکات! پێویســـتە ئەوەمـــان لە بیرنەچێت کە ئەندێشـــەو بیرکردنـــەوە لە نیعمەتە بێهاوتاکانـــی پەروەردگارن کە بە ڕۆحی ئێمەی بەخشـــیوە، تاکو لە جەستەیەکدا کە بۆ یەکجار پێدەخاتە ئەم جیهانە بەرەو کۆتاچووە بە مەبەســـتێکی پاکەوە بەکاری بێنین. بەڕاســـتی لەم جیهانەی کە ئێمـــەی مرۆڤ تیایدا دەژین پێکهاتووە لە کۆمەڵێك بنەماو پێوەری جیاواز کە هەموویان لەگەڵ ڕێڕەوو ڕێبازە جیاوازەکانی مرۆڤدا بەرەو پێشەوە دەچنو کاردەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك ڕەهەندی ئاڵۆز بونیـــان هەیە، کە هەڵبـــژاردنو شـــیکردنەوەیان تاڕاددەیەك ماندوبوونی پێویســـتە، بەتایبەتی بۆ ئەو کەســـانەی کە ئارەزووی گەیشـــتن بە کامڵبوونیان هەیە. تێکڕای سیســـتەمی خســـتنەگەڕی ئەندێشـــەی تاك بەهـــەردوو لایەنە ســـەلبیو ئیجابیەکەیەوە، دوو خاڵی کاریگەرو ســـەرەتان بۆ دوو دەرئەنجامی گەورەو چارەنوســـی یەکلاکەرەوە، ئەویش بەپێی شـــێوازو جـــۆری مامەڵەی تاك لەگەڵ ئـــەم کەناڵە چـــڕو ئاڵۆزەی نـــاوەوە. بەندی یەکەم ئـــەو قۆناغەیە کـــە مرۆڤ تیایدا چـــاو دەکاتەوە، هەر لەســـەرەتاوە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵـــی دەوروبەرو لە ژێر کاریگەری ئەوانـــدا بیرکردنەوەکانی بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەڕوات کە بوونی خۆی بەئاسانی بۆ یەکلایی نابێتەوە، چونکە ئازادبوونو سەربەســـتی (بوونی) بەسراوەتەوە بە هەڵبژاردنـــی یـــەك جیهانەوە کە بە تەســـەورو قەناعەتی لـــۆژیکی خـــۆی وێنەی دەکاتو دەینرخێنێت. ئەگەر ئارەزووی گەیشـــتن بە مەیـلو شەهەواتی ئاژەڵی هەبێت» ئەو کاتە هەر لەو چەقبەستنەدا دەمێنێتەوەو دەکەوێتە ژێر پاڵەپەستۆی ئەو نـۆشنو ئایدۆلۆژییەتە نارێـــكو هەڵانەی کە دەرگای بۆچوونی جـــوانو نوێی لە بەردەمدا دادەخـــەنو وایلێدەکەن بـــەردەوام بە دەوری خۆیدا ســـوڕبخـوات! ئەمـــەش ســـەرەنجامێکی ســـەختو دژوارەو هەر لێرەشـــەوەیە کە ویستو ئارەزوو ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن لە جوڵاندنو خستنەگەڕی ئـــەم تاکڕەهەندییە. دەبینین گشـــت هەوڵـــەکان لایەنی مادییان لەگەڵدایـــەو تەنانەت لاشـــە فیزیکیەکەش خۆراکـــی خۆی هەر لەم ڕێگایەوە بەدەســـتدەهێنێتو لایەنـــی مەعنەویو ڕۆحی ئەو مرۆڤە کزو تاریكو داخراو دەبێت، ئەمەش چارەنوســـێکی ســـەختو تاڵە. ئەوەی کە پێویســـتە ئاماژەی پێبکەین «تاکو خێزانو کومەلگایە کە تا چ ڕاددەیەك ڕۆڵیان هەیە لە کردنەوەی ئاســـۆی بیرو ئەندێشەی گەنجانو توێژەکانی دیکەی کۆمەڵ. پێویستە هەموو لایەك پێکەوە هەڵوەســـتە لەسەر مەســـەلە هەســـتیارو هەنوکەییەکان بکەنو بە ڕۆحێکی مـۆنـۆلوجی مودێرنو پێشـــکەوتوو شیـیانبکەنەوە. مرۆڤی ژێـــر ئەو کەســـەیە کە تینوێتـــی خۆی بە کانیاوی بیرو ئەندێشـــە ســـازگارەکانی کەسانێك دەشکێنێت، کە جێی متمانەی ڕاستی ئەونو پـــەردەی دڵـــی یەقین پـڕژێـن دەکەن. بۆیە هـــەر لێرەوە درك بەو ڕاســـتییە دەکات کە ویستو ئارەزوو زادەی باوەڕی تەواون، هەڵبەت ئەمەش لە ڕێگای پابەندبوون بە ســـەرچاوە پاکو شەرعییەکان، کە دەرئەنجامی بیرکردنەوەی پاکو دروستن، هەر ئەمەشە وادەکات کە ژیان جوانو دروســـت بەڕێوە بڕوات، پاشـــان پێگەیاندنی مرۆڤێکی پاکو شەرەفمەندو گەیشتن بە کەماڵی ئاسودەیی.



# ژیان فێری کردم

### ژیان فێری کردم

مرۆڤی سەرکەوتوو، ئەو کەسەیە کە دەمی دادەخات، پێش ئەوەی خەڵکی گوێچکەیان دابخەن، گوێیەکانی دەکاتەوە پێش ئەوەی خەڵکی دەمیان بکەنەوە.

### ژیان فێری کردم

ڕێگە مەدە زمانت بەشداری چاوەکانت بکات لە کاتی ڕەخنەگرتنو بینینی کەموکورییەکانی خەڵکیدا، لە بیرت نەچێت ئەوانیش وەکو تۆ خاوەنی زمانو چاون.

### ژیان فێری کردم

گفتوگۆ لەبارەی بابەتە سادەو ساکارەکانەوە کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدەن، چونکە هەندێکمان زیاتر زانیاری هەیە لە بابەتە گرنگو چارەنوسسازەکان.

### ژیان فێری کردم

ئەگەر خاوەنی دوو کولێرە بوویت، یەکێکیان بخۆو ئەوی دیکەیان ببەخشە!

### ژیان فێری کردم

ئەگەر خەڵکی وەسفو ستایشی کەسێکیان کرد، کەمێکیان ڕاست دەکەن، بەڵام ئەگەر زەمیان کرد، هەموویان ڕاست دەکەن..

### ژیان فێری کردم

ئەگەر گەیشتیتە لوتکە، سەیری دامێنی چیا بکە، بۆئەوەی ببینێتو بزانیت کێ یارمەتی داویت بۆ سەرکەوتن، هەروەها سەیری ئاسمان بکە، بۆئەوەی خودا هەمیشە پێیەکانت لەسەر لوتکە دامەزراوو جێگیر بکات.

### ژیان فێری کردم

هەر کەس بە دووڕوویی بژی، بەبێ ڕوو دەمرێت..

### ژیان فێری کردم

ئەگەر دووژمنیشت ڕاوێژی پێکردیت، ئامۆژگاری پێشکەش بکە، لەبەرئەوەی ڕاوێژکردنو ئامۆژگاریکردن، دووژمنت بۆ دەکاتە دۆست.

### ژیان فێری کردم

ئەگەر تووڕەبوویتو قسەت کرد، ئەوا قسەیەك دەکەیت کە بەدرێژایی ژیانت لێی پەشیمانیت.

### ژیان فێری کردم

گفتوگۆو چەلەحانێ نە لەگەڵ کەسی ڕەوانبێژدا بکە، نە لەگەڵ کەسی بێ عەقڵدا، چونکە کەسی ڕەوانبێژ بەسەرتدا سەردەکەوێت، کەسی بێ عەقڵیش ئازارت دەدات.

### ژیان فێری کردم

ئاکارو ڕەوشتی جوان زۆرێك لە هەڵەکانت دادەپۆشێت، هەروەکو چۆن ڕەوشتو ئاکاری ناشیرین، زۆرێك لە چاکەکانت دادەپۆشێت.

### ژیان فێری کردم

ئەگەر دوو سەگ لەسەر نێچیرێك شەڕیان بوو، ئەوا نێچیرەکەیان ئەو گورگە دەیخوات، کە دێت بەدەم هاوارو وەرینەکەیانەوە.

### ژیان فێری کردم

هەر کەس متمانەی بە خودا هەبێت لە هەمووکەس بێ نیاز دەبێت، هەر کەس بەڕاستی پشت بە خودا ببەستێت بەسیەتی، هەر کەس بەڕاستی لە خودا بترسێ، هەموو ترسێکی لەسەر کەم دەبێتەوە، هەر کەسیش بە باشی خودای ناسی شارەزاییو زانیاری تەواوی دەبێت.

### ژیان فێری کردم

خەڵکی دووجۆرن، هەندێکیان جەستەیان نەخۆشەو دڵیان تەندروستو سەلامەتە، هەندێکیشیان جەستەیان تەندروستو سەلامەتەو دڵیان نەخۆشە، زۆرکەم خەڵکم بینیوە دڵو جەستەیان پێکەوە تەندروستو سەلامەت بێت.

### ژیان فێری کردم

ئێمە وەکو منداڵ واین، ڕقمان لە حەقو ڕاستییە، هەروەکو چۆن منداڵ ڕقی لە دەرمانە، چونکە منداڵ بیر لە شیرینیو خۆشی چاکبوونەوە ناکاتەوە بە هۆی دەرمانەوە، بەڵکو بیر لە تاڵی دەرمانەکە دەکاتەوە، هەروەها ناحەقمان خۆشدەوێت، چونکە حەز لە تاموچێژەکەی دەکەین، بیر لە ژەهرەکەی ناکەینەوە.

### ژیان فێری کردم

خۆبەکەمزانین، سەری خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوە، خۆبەزلزانینیش سەری خاوەنەکەی نزم دەکات..

### ژیان فێری کردم

زۆرێك لە خەڵکی لە نێو ماڵو خێزانیاندا تووڕەو دڵڕەقن، بەڵام لە دەرەوەو لەگەڵ خەڵکیدا، نەرمو نیانو لەسەرخۆن.

### ژیان فێری کردم

هەرگیز لە چاکەکردن پەشیمان مەبەرەوە، ئەگەرچی ئەو کەسەی چاکەشت لەگەڵدا کردووە، ئەو خراپەی لەگەڵدا کردوویت، چونکە هەمیشە چاکەکردنی تۆو خراپەی ئەوان باشترو چاکترە، لەوەی خراپە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەیت، کە خراپەیان لەگەڵدا کردوویت.

### ژیان فێری کردم

باشترینو بەسوودترین سەروەتو سامان کە دوای خۆت بۆ نەوەکانتی جێدەهێڵیت، ئەوەیە باش پەروەردەکردنو فێرکردنیانە، باشترین شوێنەواریش کە دوای مردنت خەڵکی سوودی لێدەبینن، زانستو زانیاریتو خزمەتکردنتە بە خەڵکی.

### ژیان فێری کردم

لە چوار کاتدا ئاکارو ڕەوشتی پیاو دەردەکەوێت، سەفەر، زیندان، نەخۆشی، دوژمنایەتی.

# سەرەنجامی ڕاستگۆیی!

جارێکیان لاوێکی شاری هەمەدان، بە بەمەستی خوێندن بڕیاری دا بڕوات بۆ شاری بەغداد، بەڵام پێش ئەوەی لە ماڵ دەربچێت دایکی ئامۆژگاری کردو پێی گوت: کوڕی شیرینم ئاگاداربە هەرگیز درۆ نەکەیت، چونکە بڕوادار هەرگیز درۆ ناکات، کوڕە شیرینەکەم هەمیشە ڕاستگۆبە، بەڵێنم بدەرێ کە هەمیشە ڕاستگۆ بیت، ئەو کات مۆڵەتت دەدەم کە بچیت بۆ خوێندن، ئەویش بەڵێنی پێدا کە هەمیشە ڕاستگۆبێت.

ئیدی لەگەڵ کاروان بە ڕێکەوتن لە هەمەدانەوە بەرەو شاری بەغداد، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك ڕێگەیان بڕی، لە پڕ شەوێك کەوتنە نێو کەمینی ڕێگرو چەتەکانەوە، کاتێك زانیان هەرچواردەوریان گیراوەو پێیان وتن: دەستان بەرزکەنەوە، دزەکان کاروانچیو بازرگانەکانیان ڕیزکردو یەك یەك خۆیانو بارەکانیان دەپشکنی، دەگەیشتنە لای هەر کەسێکیان پرسیاریان لێدەکرد چیت پێیە؟ لە وەڵامدا دەیانگوت هیچمان پێ نییە، ئەوانیش دەیانپشکنینو هەرچی شتی گرانبەهاو بەنرخ بووایە لێیان دەسەندن، لاوە تازەپێگەیشتووەکەش دانیشتبوو، چاوەڕێ بوو سەرەی ئەمیش بێتو دزەکان بگەنە لای، کاتێك یەکێك لە دزەکان بە لایدا تێپەڕی، بینی لاوێکی تازە پێگەیشتووە، ڕووخساری لە بازرگانو کاروانچی ناچێت، جلوبەرگێکی ئاسایی لەبەردایەو لە دەوڵەمەندو خاوەن سامانیش ناچێت، ویستی بە ڕێزەوە بەلایدا بڕواتو کەسی دوای ئەو بپشکنێت، بەڵام سەرزارەکی پرسیارێکی لێکردو وتی: ئایا شتێکت پێیە؟ پرسیارەکەی بە دەم ڕێگەوە کرد، چونکە دڵنیابوو لەوەی وەڵامەکەی نەخێرە!

بەڵام وەڵامەکەی سەرسامی کردو لە جێی خۆیدا ڕاوەستا، لاوەکە وتی: بەڵێ (٤٠) دینارم پێیە، (٤٠ دیناری ئەو کاتە پارەیەکی زۆر بووە)..

دزەکە بڕوای بە گوێیەکانی خۆی نەکرد کە شتی وای بیستبێت، هەر بۆیە بۆ جاری دووەم هەمان پرسیاری لێکردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە: بەڵێ (٤٠) دینارم پێیە، دزەکە واگومانی برد کە لاوەکە گاڵتەی لەگەڵدا دەکات، دوای ئەوەی دزەکە دڵنیابوو کە لاوەکە ڕاستدەکات، بە ڕاستگۆیی لاوەکە زۆر سەرسام بوو، پێی گوت: وەرە لەگەڵم بۆ لای سەرکردەکەمان، کاتێك گەیشتنە لای سەرکردەکەیانو دزەکە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، سەرکردە هەمان پرسیاری ئاڕاستەکرد، لاوەکەش هەمان وەڵامی دایەوە، سەرکردە پێی گوت: کەواتە لە کوێ شاردووتەوە؟

ئەویش لە بنباڵیدا پارەکەی دەرهێنا، سەرکردە زۆر پێی سەرسام بوو، پارەکەی ژمارد (٤٠) دینار بوو، پاشان سەرکردە پێی گوت: چی وای لێکردیت دان بنێی بەوەدا کە تۆ ئەو پارەیەت پێیە، لە کاتێکدا هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووین کە تۆ خاوەنی ئەو بڕە پارەیە بیت؟ لە شوێنێکیشدا پارەکەت شاردبووەوە کە ئێمە هەرگیز پەیمان پێنەدەبرد؟

لاوەکە لە وەڵامدا گوتی: کاتێك لە ماڵ دەرچووم دایکم ئامۆژگاری کردم کە هەمیشە ڕاستگۆبمو هەرگیز درۆ نەکەم، دایکم بەڵێنی لێوەرگرتم کە درۆنەکەم، منیش بەڵێنم پێداو هەرگیز ناپاکی لە بەڵێنەکەی ناکەم!

سەرکردەی چەتەکان وتی: ئەم لاوە ناپاکی لە بەڵێنی دایکی ناکات، کەچی ئێمە ناپاکی لە بەڵێنی پەروەدگارمان دەکەین، سەرکردە بە وتەکانی لاوەکە زۆر سەرسام بوو، هۆن هۆن ئەسرین بە چاوەکانیدا دەهاتە خوار، ئاوڕێکی دایەوە بۆ لای لاوەکەو وتی: دایکت ئامۆژگاری کردیو تۆش ئامۆژگاریو بەڵێنەکەیت پاراست، ئێمەش ساڵانێکە ڕێگە لە خەڵکی دەگرینو ماڵو سامانیان بە ناڕەوا زەوت دەکەین، ئێستا لە بەردەمی تۆدا ئەی لاو من تەوبەو پەشیمانی دەردەبڕمو دەگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار، پاشان هەموو هاوڕێکانی بانگ کردو تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش لەگەڵ سەرکردەکەیان لە کارو خراپەکانی پێشوویان پەشیمان بوونەوەو تەوبەیان کرد، هەموو ئەو ماڵو کەلوپەلە بە نرخەش کە لە کاروانەکەیان زەوت کردبوو، گێڕایانەوە بۆ خاوەنەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا پاسەوانی کاروانەکەیان کرد تا گەیشتنە شاری بەغداد..

هەموو ئەمانەش تەنها بە هۆی ڕاستگۆیی ئەو لاوەوە بوو، کە دواتر بووە ئەو زاناو خواناسە ناسراوەی، کە ناوبانگی جیهانی گرتەوە، ئەویش (شێخ عەبدولقادر گەیلانی) بوو.

هیوا ئارام



ن: عبدالكريم الشطي          و: ئەسکەندەر ڕەحیم



# نانبڕاوێك!

«مەزنەکان دوو جۆرن؛ جۆرێکیان موعجیزەی گەورە دروست دەکەنو مێژوو دەگۆڕن، جۆرەکەی دیکەشیان، بە هەزار هەزار، لەو شتە بچوکانە دروستدەکەن، کە جۆری یەکەم دروستی دەکەن».

کاتێك لە نوسینگەی سەرۆك کۆمپانیاو لەسەر ئەو کورسییەی بەرامبەر مێزەکەی بوو، دادەنیشتمو سەرۆکیش لە پەیوەندییەکی درێژی تەلەفۆنیدا هاتو هاواری بوو، تەماشای ئەم گوتەم دەکرد، کە لە تابلۆیەکی دیوارەکەی پشت سەرییەوە هەڵکۆڵرا بوو. جگە لەو گوتەیە، هیچی دیم بەدی نەدەکرد، تا وەڕزیی خۆمی پێ بڕەوێنمەوە، هەر چەند سەدان جار خوێندبوومەوە، وەلی لێی حاڵی نەدەبووم! وەلی بەم دواییانە تێیگەیشتم، هەڵبەت لە کاتی دانیشتنم لە نووسینگەی سەرۆکدا، لێی تێنەگەیشتم، بەڵکو تێگەیشتنی ئەو گوتەیە، لە شەقامدا بۆم هاتە پێش!

ئەوێ ڕۆژێ، پاش ڕۆژێکی پڕ لە ماندووییو شەکەتیو هاواری سەرۆك بە ڕوومدا، لە ناو ئۆتۆمبێلەکەمدا بووم، چاوەڕێی ئاماژەی سوری هاتوچۆم دەکرد، تا بە تیشکی سەوزی، سڵاوم لێ بکاتو بەرەو ماڵ، بگەڕێمەوە! لەو دەمەدا، شۆفێرێك کە ئۆتۆمبێلێکی داشقەی پێ بوو، هێندە کۆن ببوو، وڕەوڕی بزوێنەرەکەی، هەموانی بێزار کردبوو، جامی ئۆتۆمبێلەکەی کردەوەو قوتووە ساردییە بەتاڵەکەی، هەڵدایە سەر شەقامەکە! ئۆتۆمبێلێك لەو ئۆتۆمبێلە گەورەو گرانو دوایین تەرزانەی هەر لە خەونو بانگەشە بازرگانییەکاندا دەیبینین، لە پشتییەوە ڕاوەستا، لەو ئۆتۆمبێلە، پیاوێکی کەڵەگەتی شیکپۆشو لەشجوان دابەزی، ئەو پیاوە بە ڕەنگیدا دیاربوو، دەوڵەمەندو خوداپێداوە. ئەو دەوڵەمەندە بەرەو ئەو قوتووە ساردییەی فڕێدرا بووە ناوەڕاستی شەقامەکە، ڕۆیشت.. تا هەڵی بگرێتەوەو لە نزیکترین زبڵداندا دایبنێت، خۆ ئەو هەر شەقامەکە خاوێن ناکاتەوە! بەڵکو خزمەتێکیش بەو هەژارە دەکات، کە ئۆتۆمبێلێکی داشقەی هەیە!

ئەوە یەکەمجار بوو، لە ژیانمدا دەوڵەمەندێکی بێفیز ببینم، خزمەت بە هەژارێکی بەفیز بکات! کابرا هەژارەکەش لە ئۆتۆمبێلەکەی هاتە دەر، دەیویست بە کاکی دەوڵەمەند بگاتەوە، تا داوای لێبوردنی لێ بکات، بەڵام ڕووناکی سەوزی هاتوچۆ، هەڵبوو، هۆڕینی ئۆتۆمبیلەکانی دیکە، کردیان بە هەڵلا. ئیدی گەڕایەوە بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکەی!

منیش ئاگری زانین لە دڵم بەربوو، وای لێکردم، بە ئۆتۆمێبلەکەم، بە شوێن دەوڵەمەندەکەدا بڕۆم.. لەبەرچی؟ نازانم، ئایا لە ناوی دەپرسم؟! یان لێی دەپرسم: بۆ ئەوەت کرد؟ لەو دەمەدا کە بە شوێن دەوڵەمەندەکەدا دەڕۆیشتم: ئاخۆ.. بۆچی.. کێ.. کەی؟؟؟ دەیان پرسیار بە مێشکمدا دەهاتو دەچوو، ئەمە ڕەنگدانەوەی چ بەهاو ڕەوشتێکە، لە ڕەفتاریدا؟! ئۆتۆمبێلەکە لە یەکێك لە گەڕەکە ناوازەکان نزیککەوتەوە، لەبەردەم خانەباخێکدا ڕاوەستا، دەرگا ئەلیکترۆنییەکەی کرایەوەو ئۆتۆمبیلەکە چووە ژوورەوە، لەم دەمەدا زەق زەق، لەم دیمەنەم دەڕوانی.

چەند خولەکێك بە ڕاماوی مامەوە، لە خۆم نەدەپرسی.. چیم پێدەکرێت؟ بەڵکو لە خۆم دەپرسی: ئەو ڕازە چییە، هانی ئەو دەوڵەمەندەی داوە، تا پاشماوەی هەژارەکە، خاوێن بکاتەوە؟ نەخوازە منیش، کە ناووناوبانگی دەوڵەمەندان، لەلام زۆر بەخراپ دەهاتە بەرچاو، چونکە زۆربەی ئەوانەی لەگەڵیاندا خوێندوومەو لەگەڵیاندا ژیاوم، لە چینی دەوڵەمەندەکان بوونو جیاوازو بەنازپەروەردەو بێزارکەرو هەستی پەستی دایدەگرتن! پێش ئەوەی بکەومە سەر ڕێ، سەرنجی ناوی خاوەن خانەباخەکەمدا، لە لای دەرگای دەرەوەی خانەباخەکە. ببورە.. ئەو ناوەی نووسرابوو.. یەکێك بوو لە هەرە دەوڵەمەندەکانی وڵاتەکەم، کە وابێت لەبەرچی ئەم کارە دەکات؟! ئەم دەوڵەمەندە خوداپێداوە، لەو دەوڵەمەندانەی پێشتر ناسیومن، زۆر ناوازەو جیاوازە.. بەو بەهاو ڕەوشتە تایبەتییانەی باوەڕی پێیان هەیە، جیا دەکرێتەوە.

ڕۆژی دواتر لە کۆمپانیاو لە نووسینگەی سەرۆك دانیشتم، چاوەڕێم دەکرد، تا جەنابی سەرۆك لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە ببێتەوە، کە لەگەڵ بانکێکی هەندەراندا ئەنجامی دەدا، هەڵبەت ئەمە سروشتی هەمیشەیی بوو، بۆ ڕاپەڕاندنی کارێك بانگی دەکردم.. پەیوەندیی تەلەفۆنی بۆ دەهات، لەبیری دەچوومەوەو تا ئەو کاتەشی پەیوەندییەکەی تەواو دەکرد، دەبووم بە بەردێکی بێهەستو بێ جوڵە.

پێشتر نەهاتبووە پێش.. لەگەڵ جەنابی سەرۆکدا، سەبارەت بە بابەتی بەدەر لە کار، بدوێم، چونکە تا بڵێی کەسێکی بەکارو بێکات بوو، لەبەر ئەمە، ڕۆژێك لە ڕۆژان، پەیوەندیی پێمەوە، سنوری ئیشو کاری نەترازاندبوو. پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەی دوایی هاتو لەبارەی کاروبارەوە دەستمان بە وتووێژکرد.. پاشان داوای لێکردم بڕۆم، منیش لە جێی خۆم هەستام، کە دەستم خستە سەر دەسکی دەرگاکە، ئاوڕێکم بە لایدا دایەوە، ئەویش بە گومانو سەرسوڕمانەوە سەیری کردم، بێئەوەی زمانی خۆمم پێ زەوت بکرێت، ئەم پرسیارەم، هاتە سەر زار:

- ئاخۆ فڵان کەسی فیسار کەس دەناسی (ناوی بازرگانەکەم هێنا)؟

هەردوو چاوانی، لەتاو توڕەیی ئەبڵەق بوون، بە ڕووگرژییەوە لێی ڕوانیم، بۆ ماوەیەکی زۆر لێی ڕوانیم، کۆتا گوتە، کە چاوەڕێم دەکرد، لە ژیانمدا بێتە پێش.. هاتە سەر زاری، گوتی:

- تۆ دەرکرایت، لەمڕۆ بەدواوە، نامەوێت چاوم بە ناوچاوت بکەوێتەوە.

توڕە بووم، بگرە ئاگرم گرت، هەڵبەت لەبەرئەوە نا، کە لە کار وەدەرنرام! بەڵکو لەبەرئەوەی بەبێ هیچ هۆو گوناهێك، نانبڕاو کرام، بەبێ مۆڵەتی یەك ڕۆژیش! ئاخۆ دەبێت چی لە قیستە مانگانەکانم بکەم؟ چۆن کارێکی نوێ بدۆزمەوە؟ چی لە گەڵاڵەو پڕۆژەی هاوسەرێتی داهاتوو بکەم؟ هەر لەبەرئەوەی ناوی کابرایەکی نائاشنا بۆ من، بە زارمدا هاتووە، چۆن دەبێت وەدەرنرێم؟! پاشتر لە کۆمپانیا بە دڵێکی شکاوەوە لە کۆمپانیا هاتمەدەرو ئۆتۆمبێلەکەم هەڵکرد، وێڵو سەرگەردان بە ناو شەقامەکاندا ڕێم دەکرد، کەفوکوڵی توڕەییو پەستیشم، سەر ڕێژی دەکرد، لە پڕدا بێئەوەی هەست بەخۆم بکەم، بینیم خۆمو ئۆتۆمبێلەکەم، بە ڕێگەیەکدا دەڕۆین، بەرەو ماڵی ئەو دەوڵەمەندە خوداپێداوە دەچێت،

ئەو كەسەی بوو بە مایەی دەردەسەریم، ئەو کەسەی سەرچاوەی ئەو کارەساتە جەرگبڕە بوو، ئۆتۆمبێلەکەم لەبەردەم دەرگای گەراجەکەدا ڕاگرت، بەدڵی پڕ لە ڤینەوە، پەنجەم خستەسەر سویچی زەنگەکەو زیاتر لە خولەکێك بەردەوام بووم، دەستم لەسەری هەڵنەگرت، تا کوڵی دڵم دامرکا، دەنگی زەنگی ئەو ماڵە، بەو کۆڵانە هێمنو زەنگینەدا پەخش بووەوە، وردە وردە ڕووخساری خزمەتکارەکان لە پەنجەرەکانەوە دەردەکەوتن، تا بزانن ئەوە کێیە، سنگی خۆی دەردەپەڕێنێتو هێوری ئەم گەڕەکە ناوازەو زەنگینە دەزڕێنیت؟! ئیدی لەو دیوەوە، گوێم لە تەقەی پێی یەکێك بوو، بەرەو دەرگاکە دەهات! پاشان گەڕامەوە نێو ئۆتۆمبێلەکەمو چاوەڕێم کرد، پاش کەمێك، خزمەتکارێك لە ماڵ هاتەدەرو بە توڕەییەوە، دوو سێ جار، دەستی بە جامی ئۆتۆمبیلەکەدا کێشا، جامەکەم کردەوەو بەتووڕەییەوە گوتم: خاوەنی ئەم ماڵە لە کوێیە؟ ئەویش بە ڤێزو بێزێکەوە، لێی ڕوانیمو گوتی: کاکە بڕۆ، دەنگە دەنگ مەکە، تۆزێکی دیکە دێتەوە بۆ ماڵ.. دیسان پێت دەڵێم: بڕۆ.. گرفت بۆ منو بۆ خۆشت مەسازێنە..

هێشتا بەتەواوەتی قسەکانی تەواو نەکردبوو، ئۆتۆمبێلی خاوەنماڵم دی، لە پشتمەوە ڕاوەستا.. خێرا خزمەتکارەکە، بەرەو پیری چوو، ڕاپۆرتێکی خێرای پێدا، کابراش بە هەمان ئەو شانوشەوکەتەی، بۆ ڤوتووە ساردییەکە دابەزی، دابەزی.. بە چەند هەنگاوێکی نەرمو لەسەرخۆی ناو هاتە لای جامی ئۆتۆمبێلەکەمو زۆر بەڕێزانە سڵاوی لێکردمو گوتی: براگیان.. چۆن دەتوانم یارمەتیت بدەم؟

لەم ساتەدا، لە گێژاوی بێئاگاییو بەڵای دڵکوتم بەئاگا هاتمەوە، لە خۆم پرسی: لێرەدا چی دەکەم؟! چیم لەم پیاوە دەوێت؟! لەوەی ڕووی داوە، چ تاوانێکی هەیە؟ ئایا تاوانەکەی ئەوەیە کە ناویم لەپێش جەنابی سەرۆکدا هێناوە؟! خۆ ئەو داوای لێنەکردم ناوی بهێنم، دیارە هەر ناشمناسێت، کەچی منیش، بەوپەڕی ناشیرینییەوە، لەبەر دەروازەی ماڵیدا، بێزاری دەکەم، یان ڕێ لە چوونە ژوورەوەی ئۆتۆمبیلەکەی دەگرم!

- کاکەگیان بفەرموو با بچینە ژوورەوە، چایەکت بۆ دەم بکەمو مێشکت بحەوێنێتەوە؟

ئای لە نەرمونیانی ئەوو توندو توڕەیی من! لە خەوی غەفڵەت بێداربوومەوە، داوای لێبووردنم لێکرد، داوام لێکرد جێی بهێڵم.. بەڵام پێداگری کردو گوتی: هەر دەبێت بفەرمویت بۆ ژوورەوە، بە پێشنیازەکەی ڕازیبووم.. هەرکە چوومە ژوورەوە.. چیم دی؟! کەلوپەلی نوێی ئاوێزانو گونجاو لەگەڵ چەندان تابلۆی دانسقە، پاشان ڕێنوێنی کردم بۆ گۆشەی چانۆشین.. خانمە خزمەتکارێك پونگەی تەڕوتازەی هێنا، خۆی ڤۆرییەکەی هێنا.. لە سەروبەندی چارەکە سەعاتی یەکەمدا.. خۆمم بینی وا لەبەردەم نەرمونیانیو خۆشمامەڵەییەکەیدا، تێکدەشکێم، ئیدی دەستم بە گێڕانەوەی باسوخواسی خۆم کردو پێم گوت چۆن ناوی تۆ، نانبڕاوی کردم، خەندەیەك هاتە سەر لێویو هەر بە خەندەوە لێی پرسیم: ناشێت لە کۆمپانیای..... کار بکەیت؟

- بەڵێ لەوێ کاردەکەم.. بەڵام چۆنت زانی؟

- تۆ سبەی بەیانی وەرە بۆ نوسینگەکەم، وا دابنێ گرفتەکەت بە تەواوەتی چارەسەربووە..

سبەی بەیانییەکەی.. چارەکێك پێش وادەکە، بە نووسینگەکەی گەیشتم، پاش چەند خولەکێکی کەم، بەژنوباڵای ڕێکوپێکی دەرکەوتو بەڕێوەبەری دارایی کۆمپانیاکەی خۆیشی لەگەڵدا بوو، داوای لێکردم، هاوڕێیەتی بکەم.. چووینە ناو ئۆتۆمبێلەکەیەوەو دەرچووین، هەتا گەیشتین بە.. کۆمپانیا کۆنەکەم!

- دوێنێ بوو، لێرە وەدەرنرام.. ئەمڕۆکەش دەمگێڕیتەوە بۆی؟!

- من ناتگێڕمەوە.. پێم گوتی مەپرسە! پەلەت نەبێت، زوو هۆکارەکەی دەزانی.

- تکات لێدەکەم.. مەبە بە مایەی گێڕانەوەم بۆ ئەم کارە..

- پێی گوتم: پەلەت نەبێت..

لە پاش چەند خولەکێك، چووینە ناو کۆمپانیاکەوە، کارمەندەکان تێکڕا، چاویان تێ بڕیبووم، دیاربوو هەمووان ئەم بازرگانەیان دەناسی، هەموو لایەکیش دەیانزانی، من کارمەندێکی ئاساییم، چۆن دەگونجێت لەگەڵیدا بەو شانبەشانی بڕۆم، کاتێك جەنابی سەرۆك (ئەو کەسەی دوێنێ دەری کردبووم)، بە بزەی لێوو بەخێرهێنانی گەرمەوە، بۆ پێشوازیمان هات.. سەرسامیی هەمووان بە لوتکە گەیشت. سەیرە.. تا دوێکە بوو، هەر لەبەرئەوەی ناوی ئەم دەوڵەمەندەی هاتە بەرگوێ، وەدەرینام.. ئێستەش بەوپەڕی گەرموگوڕییەوە، سڵاوی لێدەکات!!!

چووین بۆ ژووری کۆبوونەوە -کە پێشتر ڕێگەی نەدەدام بچمە ناوی- دیمانەکە بە باسوخواسی لاوەکی دەستی پێکرد، تا بەربەستی بێمتمانەیی پێ بشکێت.. هەر زوو زانیم، هەردوو لا لەسەر ژمارەیەك کەمکردنەوەی گەورە، شانەخڕێی یەکدییان کردووەو لە هەمووشیاندا، پیاوە دەوڵەمەندەکە براوەبووە.. دوایین جاریش دوێ بەیانی بووە.. پاشان جەنابی سەرۆك گوتی: لە ئاکامی کەمکردنەوەکان، زۆر سەرم سوڕماوە.. تاکە لێکدانەوەی گونجاویش - بە بۆچوونی ئەو - ئەوەیە: کەسێك زانیارییەکانی بۆ بەرەی بەرامبەر دزە پێکردووە -بە لاچاوێکەوە سەیرێکی کردم- تا نرخو مەرجی کەمتر دابنێت.

دەوڵەمەندەکە بزەیەکی کردو داوای لە بەڕێوەبەرە داراییەکەی خۆی کرد، بابەتەکەیان زۆر بەڕوونی تێبگەیەنێت.. تا ڕاستگۆییو سەرڕاستی خۆی، بیسەلمێنێتو ئەوەش ڕوون بکاتەوە: بەرچاوتەنگیو فرتوفێڵ، لەم نێوەندەدا بوونی نییە. یەکسەر بەڕێوەبەری دارایی هەستاو بڕێك نووسراوی کۆمپانیاکەیانی دەرهێنا.. نهێنیی ئەو پەیوەندییە نایابەی خستە ڕوو، کە لەگەڵ بڕێك لە کارگەکانی ئاسیادا هەیانە.. بەوەش توانیویانە ماددە سەرەکییەکانیان، بە هەرزانترین نرخ، دەستبکەوێت.. پاش ڕوونکردنەوەکە، شتێك ڕووی دا، کە زۆر پێم سەیر بوو.. بازرگانەکە پێشنیازێکی بۆ جەنابی سەرۆك کردو گوتی:

ڕاستییەکەی، ئەم پرۆژانە زۆر گەورەن.. پێمان خۆشە، لە بازاڕدا کۆمەڵێك برابەشی باشمان هەبێت، تا پرۆژەکان لە کاتی خۆیاندا، ڕاپبەڕێنین، لەبەرئەمە هیوادارم بواری هاوکاری هەبێت لە نێوانماندا، تا ئەم کەمکردنەوەیەی کۆتایی جێبەجێ بکەینو قازانجەکان لە نێوانماندا دابەش بکەین..

جەنابی سەرۆك زەردەخەنەیەکی کردو دەستبەجێو بێدوودڵی ڕازیبوو.. پاشان بازرگانەکە گوتی:

- بەڵام بۆ تەواوبوونی برابەشییەکەمان، کۆتا مەرجم هەیە..

- سەرۆك گوتی: بەسەر سەرو بەسەر چاو.. فەرموو..

- دەمەوێت ئەم کوڕە –ئاماژەیەکی بۆ من کرد- ببێت بە بەڕێوەبەری پرۆژەکە.. چی دەڵێن؟

سەرۆك بە خەندەیەکەوە گوتی: بە بڕوای من دەبێت ڕازی بم.. تا ئەو هەڵەیەم ڕەش بکەمەوەو قەرەبووی ئەو ناهەقییە بکەمەوە، کە لە هەقی ئەم لاوەدا کردوومەو لە کارەکەی وەدەرم ناوە.

ئای خودایەگیان، تا دوێنی بوو لە کارێکی ئاسایی دەرکرام، ئەمڕۆش من بەڕێوەبەری پرۆژەیەکی گەورەم!

بیرم لە ئاکارجوانیی ئەم بازرگانە خوداپێداوە دەکردەوە.. ئەو پیاوێك بوو، ڕێزی خۆی دەگرتو ڕەوشتو بەهاکانی خۆی پێ بەنرخ بوو.. هەر لەبەرئەوە جیاوازی نەدەخستە نێوان داراو نەدار.. چونکە بیروباوەڕ هەر بیروباوەڕە، ڕێزگرتنیش هەر ڕێزگرتنە. ئەو دەمەشی لە پرۆژەکەدا کارم کرد، لەو پیاوە دەوڵەمەندە، چەندان هەڵوێستی مرۆڤانەم دی، کە لە باس نایەت.. سا لەبەرئەوە سور بزانە.. دەروازەکانی چاکە، هەمیشە لەسەر پشتو ڕێزیش درەختێکە، نەمامەکەی لە دڵو دەروونماندا دەڕوێنینو بەرهەمەکانیشی بۆ دەوروبەرمانە..

سەرچاوە: www.rekaaz.com



# منداڵی تەندروست

گوڵان حەمە ئەمین

بەرهەمهێنانی منداڵێکی تەندروست، بۆئەوەی تاکێکی بەسود بێت بۆ خودی خۆیو خزمەت بە خێزانو کۆمەڵگا پێشکەش بکات، پێویستی بە ژینگەیەکی لەبارو تەندروستە، ئەویش لەپێش هاوسەرگیرییەوە، پاشان لە ژینگەی سکی دایکەوە دەست پێدەکات، دیارە هەر لەو سەرەتایەوە کاری پەروەردەو بەرپرسیارییەتی دایکو باوك بەرامبەر بە کۆرپەلە دەستپێدەکات، سەرەتا هەریەك لە کچو کوڕ، پێش هاوسەرگیری پێویستە تەنها حەزو بەرژەوەندی خۆیان لە بەر چاونەگرن، بەڵکو بیر لەوە بکەنەوە کە دایکێکی باش، یاخود باوکێکی باش بۆ نەوەی داهاتوویان هەڵبژێرێت، لە ڕووی تەندروستی دەرونیو جەستەییو کۆمەڵایەتییەوە، لەبەرئەوەی زانست سەلماندویەتی منداڵ، لە ٥٠٪ سیفاتی دایكو لە ٥٠٪ی سیفەتی باوك هەڵدەگرێتەوە، باشتروایە ماوەیەك دیاری بکرێت تا هەردوو هاوسەر لێکتێدەگەن، هەروەها لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە باشترین تەمەنی دایك لە نێوان (٢٢بۆ٢٩) ساڵیدایە، گەرتەمەنی دایك لە خوار ئەو تەمەنەوە بێت، زۆرجار منداڵ لە ڕووی جەستەیشەوە ناتەندروست دەبێت، هەروەها لەسەرو ئەو تەمەنەشەوە، منداڵ لە ڕووی ژیرییەوە ناتەندروست دەبێت، پاشان دەبێت کەشو هەوای خێزان لەباربێت بۆ پێشوازیکردن لە نەوەی نوێ، گرتنەبەری چەند ڕێگایەك بۆ ئەو ئامانجە لەوانە ئامادەیی دایك لە ڕووی دەرونیو لاشەیی، چونکە هەندێك باری دەروونیو جەستەیی دایك کاریگەری لەسەر منداڵ جێدەهێڵێت:

١- حەزکردن لە بوونی منداڵ: کاتێك دایك حەز بەبوونی ئەو منداڵە بکات، لە ڕووی دەرونییەوە ئامادەباشی هەبێت بۆ دروستبوونی ئەو کۆرپەلەیە، ئەوە دەبێتە هۆکاری ئامادەیی «رحم» بەوەی ببێتە ژینگەیەکی گونجاو، لە ڕووی خۆراکیو ئۆکسجینو خاوبونەوەو ئەمەش دەبێتە هۆی ئاسودەیی کۆرپەلە، هەروەك چۆن حەزکردنی باوکیش بە بوونی منداڵ، کاریگەری دەبێت لەسەر کۆرپەلە، بە پێچەوانەوە حەز نەکردن بە بوونی ئەو منداڵە، دەبێتە هۆی گرژبونی «رحم»، تەنگەژەیی بۆ کۆرپەلە دروست دەبێت، سەرەنجام هۆکارێکە بۆ ناتەندروستی دەروونی منداڵ.

٢-باری دەروونی دایك: کاریگەری لەسەر کۆرپەلە جێدەهێڵێتو لە داهاتووی ئەو منداڵەدا ڕەنگدانەوەی دەبێت، وەك خەمۆکی دایکو حەزنەکردن بە ژیان، هەروەها باری دەروونی باوکیش هەمان کاریگەری دەبێت، لە کاتێکدا ئەو منداڵە کۆرپەلەیەکە «جنین» لە «رحم»ی دایکیدا.

٣- باری جەستەیی دایك: تەندروستی دایك لە ڕووی جەستەییەوە یەکێکی ترە لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ بەرهەمهێنانی منداڵێکی تەندروست، هەروەك ناتەندروستی دایکو بوونی هەندێ نەخۆشی دەبێتە هۆی شێواوی زگماکیو سەرهەڵدانی چەند نەخۆشییەك لە منداڵدا، یاخود کەمی هەندێ مەواد لە جەستەی دایکدا، هەر بۆیە پێویستە دایك گرنگی تەواو بدات بە خۆراکو لاشەو تەندروستیو وەرزش، هەموو ئەمانەش بە وەرگرتنی ڕێنمایی کەسانی پسپۆڕ.

٤- بەرکەوتنی تیشك «الاشعە»: دایك دەبێت زۆر وریایانە مامەڵە بکاتو خۆی بپارێزێت لە بەرکەوتنی تیشکو بەکارهێنانی هەندێ دەرمان کە کاریگەری خراپی دەبێت بۆ تەندروستی منداڵ، بەرکەوتنی تیشك بۆ دایکی دووگیان دەبێتە هۆی شێواوی کۆرپەلە لە ڕووی جەستەییو کاریگەری بۆ ژیری منداڵیش هەیە، هەر بۆیە پێویستە دایك بەتایبەت لە کاتێکدا کە دەگونجێ دووگیان بێت، بەڵام لە ڕۆژەکانی سەرەتادابێتو دایك نەیزانی بێت، پێویستە خۆی بپارێزێت، هەموو کات ئەگەری بوونی دووگیانی لەپێشتردابنێت، تا نەبوونی.

٥- بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانو جگەرەکێشانی دایباب: دەبێتە هۆکاری لەبارچونو لە دایکبوونی پێشوەختو ناتەندروستی جەستەیی.

٦- بەکارهێنانی «المشروبات الکحولی»: هۆکارێکە بۆ لاوازی زیهنی منداڵو شێواوی لاشەیی لە دڵو ئەندامەکان بەگشتیو سەرو ڕووخسار.

٧- کاری دایك: ماندووبوونو کاری دایك بەتایبەت لە سێ مانگی کۆتایی دووگیانی، دەبێتە لاوازی منداڵو کەمی کێشی.

٨- هاوتانەبوونی خوێنی دایباب: چەند کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر منداڵ لەوانە، لاوازی ئاستی زیرەکی ژیری منداڵ ...

ئەمانە چەند تێبینییەکی گرنگە پێویستە، دایبابەکان بە هەندی وەربگرن، لەپێناو بوونی منداڵێکی تەندروستدا.

هەروەها دایك ڕووبەڕووی چەند بارێکی دەروونیو جەستەیی دەبێتەوە لە کاتی دووگیانیدا، وەك ڕشانەوە بەتایبەت لە کاتی بەیانیاندا، لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان ئاشکراکردووە، کە سەرەنجامی باری دەروونی دایکە، لە ژێری ناوەکیدا کاریگەری دەبێت، وەك گوزارشتی لە ڕەفزکردنو ترسان لەو کاریگەرییانەی بە هۆی دووگیانییەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، یاخود بە هۆی گۆڕانکاری هۆرمۆنییەوە ڕوودەدات.

هەموو ئەوەی ئاماژەمان پێدا، گرنگی دووگیانیو گرنگی بەرهەمهێنانی منداڵێکی تەندروستمان پێدەڵێت، لە ڕۆژەکانی سەرەتای دروستبونی کۆرپەلە، تا کۆتا ساتی پەروەردەو پێگەیاندن.

سود لە «الصحة النفسية للطفل» وەرگیراوە.

# ئەو پیاوەی لە ئاوەکەدا خنکا..

دەگێڕنەوە جارێکیان لە گوندێکدا پیاوێکی خوداپەرست هەبوو، ئاکارو کردوە جوانو دینداریيەکەی وایکردبوو کە هەموو خەڵکی گوندەکە خۆشیان دەویستو متمانەیان پێی هەبوو..

خەڵکی گوند بۆ هەموو پرسیارو ڕاوێژو کاروبارێکی ئاینی، دەگەڕانەوە بۆ لای ئەم خواناسو ئیمانداره..

ئەوان بە پێشەنگو مامۆستای خۆیان دەزانی، هیچ کارێکیان بێ پرسی ئەو ئەنجام نەدەدا..

قەدەر وابوو، ڕۆژێك گوندەکە دووچاری لافاوێکی سەخت بووەوە، دەرچوونو خۆڕزگارکردن لەو لافاوە زۆر ئاستەم بوو..

چەند کەسێك لە خەڵکی گوندەکە بە بەلەمێکەوە چوونە لای ئەم پیاو باشەو پێیان گوت: لەگەڵ ئێمە وەرە، لافاوەکە سەختەو تا دێت توندتر دەبێت، وەڵامی دانەوەو گوتی: پێویستم بە هاوکاری کەس نییە، خودای گەورە خۆی من ڕزگار دەکات، ئێوە بڕۆنو خەمی منتان نەبێت..

پیاو باشەکە بەردەوام دوعای دەکردو دەیگوت: خودایە ڕزگارم بکە، لەو کاتەدا کەسانێکی دی بە کەشتییەوە بەلایدا تێپەڕینو گوتیان: لەگەڵ ئێمە وەرە، ئەمڕۆ ئاستەمە کەس لە زیانی ئەم لافاوە ڕزگاری ببێت، دووبارە گوتی: پێویستم بە هاوکاری کەس نییە، خودای گەورە خۆی من ڕزگار دەکات، ئێوە بڕۆن..

پاش ماوەیەکی ترو بۆ جاری سێیەم کەسانێکی دیکە هاتن بۆ لای ئەم پیاو باشەو هەوڵیان دا ڕزگاری بکەن، پێیان گوت: لەگەڵ ئێمە سەرکەوە چونکە ئێمە کۆتا کەسین کە لەم گوندەدا ماوینەتەوە، ئەگەر لەگەڵ ئێمە نەیەیەت، ئەوا بە دڵنیاییەوە لە ئاوەکەدا دەخنکێیت؟

هەمان وەڵامی ئەوانیشی دایەوەو وتی: ئێوە بڕۆن، من خودای گەورە ڕزگارم دەکات..

پاش چەند ڕۆژێك لافاوەکە تەواو بوو، خەڵکی گەڕانەوە بۆ گوندەکەیان، بە پەرۆشەوە دەگەڕان لە شوێنەواری مامۆستاکەیان، تا بزانن چی بەسەرهاتووە، بەداخەوە تەرمەکەیان دۆزییەوە، مشتومڕ لە ناو خەڵکی گونددا دروست بوو، خەڵکی دەیانگوت بۆچی خودای گەورە ئەم پیاو باشەی ڕزگار نەکرد؟ بۆچی خودا نزاکانی گیرا نەکرد؟ کار گەیشتە ئەوەی خەریکبوو هەندێك لە خەڵکی ئاوایيەکە لە ئاینەکەیان پەشیمان ببنەوە!

لەو کاتەدا لاوێکی تێگەیشتوو ڕۆشنبیری خاوەن زانست هات بۆلایان، کاتێك ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوەو تەواو لە مەسەلەکە حاڵی بوو، پێی گوتن: کێ دەڵێت خودای گەورە ئەم پیاوەی ڕزگار نەکردووە؟ خودای گەورە (٣) جار ئەو بەندەیەی ڕزگار کردو نزاکانی گیرا کرد، مەگەر سێ کۆمەڵی یەك لە دوای یەکی نەنارد بۆ لای، تا یارمەتی بدەنو ڕزگاری بکەن لە لافاوەکە، بەڵام ئەو لەگەڵیاندا نەڕۆیشتو بە هاوکاریو یارمەتییەکانیان ڕازی نەبوو؟!

کەواتە دەکرێت ئەم ڕووداوە ببێتە پەندو وانەی زۆری لێوە فێربین، خودای گەورە بە ڕێگای وەهمیو خورافیات بەندەکانی لە تەنگژەو ناڕەحەتیو تیاچوون ڕزگار ناکات، خۆناکرێت فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دابەزێو هاوکاریمان بکات، بێگومان هاوکاریو یارمەتیدانو ڕزرگاربوونمان لە ناڕەحەتییەکان، بە هۆی ئەو کەسانەوە دەبێت کە خودا بۆمان دەستەبەردەکات، بێگومان هەموو شتێك هۆکارێکی هەیە، ئەوەی پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەوەیە کە تێبکۆشێت تا ئەو کاتەی هاوکاریو یارمەتییەکانی خوداوەندی پێدەگات، ئەویش لە ڕێگەی بەندەکانییەوە، نەك لە ڕێگەی شتی وەهمیو خورافیاتەوە..

**ئالانی**





# چوارساڵ وەك شەوو ڕۆژێکە

ئاسۆ حاجی

((هەموو ڕۆژێك، ڕۆژێکی نوێ دەخەینە سەر تەمەنمان، هەرچەندە تەمەنمان گەورە دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا لە تەمەنمان کەم دەبێتەوە، چونکە هەر کە بووین، یانی نەماین، بۆ هەموو ڕووداوەکانی ژیان، هەتا ئەگەر گوڵێکیش بێت، ئەمڕۆ خونچەیە، سبەینێ گوڵەو دوو سبەی پەڕەی هەڵوەریوە))..

ئەمە نووسراوی یادگارییەك بوو لە ناو ئەو دەفتەرەی کە هاوڕێیەکم بۆی هێنابووم، تا یادگاری بۆ بنووسم، لە کۆتاییەکانی سالانی خوێندنی کۆلێژ، ئەو شەوە زۆربیرم لەم وشەو دێڕانە کردەوە، بەڕاستی ئەو دەستەواژەیە زۆر جوانو ڕاست بوو، چونکە چوار ساڵ لەمەوبەر کە هاتینە کۆلێژ، وامان دەزانی هەرگیز تەواو نابێت، بەتایبەتی ئەو شەوانەی لە بەشی ناوخۆیی بووین، بە هەڵسو کەوتو گاڵتەکردنمان، چەندین جار دڵی یەکترمان ئازار دەدا، لەسەر شتی زۆر بێبایەخ لە یەکتری زیز دەبووین، زۆرجار سڵاوێکی گەرممان لە یەکتر نەدەکرد، گەر هاوڕێیەکمان پێویستییەکی ببوایە بە دەمییەوە نەدەچووین، زۆرلامان گرنگ نەبوو، قەدری ئەو شەوو ڕۆژانەمان نەدەگرت، کە پێکەوە بووین، هەرچی خۆمان حەزمان لێبوایە دەمانکرد، لەسەرحسابی هەرکەسێك بووایە، بیرمان نەدەکردەوە کە دوو ڕۆژی تر، یەکتر جێدەهێڵین، کێ دەڵێت: یەکتر دەبینینەوە وابەئاسانی؟!

شەوێك یادگاریم بۆ ئەو هاوڕێیەم دەنووسی، کە چوارساڵ بەر لە ئێستا هاتینە کۆلێژ یەکەم کەس بوو ناسیم، کەچی وادەزانم دوێنێ بوو، بۆیە دەمگوت: ئایا هیچ چاکەیەکی وام کردووە، ئەگەر بەیانی لە یەکتر دابڕاین، یادم بکات، یان لە شوێنێك یەکترمان دیتەوە، وەك برا باوەش بەیەکدا بکەینو بەخۆ شحاڵییەوە ئەملاو ئەولای یەکتر ماچ بکەین، چونکە پیاسەکردنی ئەمڕۆی ژێر سێبەری درەختەکانو دانیشتن لەسەر ئەو کورسییانەی لای گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکانو هاتووچۆی ئێوارانی شەقامەکان، جارێکی تر نایەتەوەو ناگەڕێتەوە، ئێمەش کە هەر یەکە لە شارێکەوە هاتبووین، زەحمەتە وا بەئاسانی یەکتر ببینینەوە، بۆیە ئێستا زانیم کە دوێنێ بوو هاتمە کۆلێژ، بەڵام ئەمشەو واخەریکی خواحافیزیم لە هاوڕێکانم، لەبەرئەوەی ئێمە دوو وانەمان لەوانی تر کەمتر بوو، نزیکەی سێ ڕۆژ زووتر لێ بووینەوەو بەیانی بەجێیان دەهێڵم.

بۆ بەیانی خۆمو سێ هاوڕێم بە یەکەوە خۆمان پێچابووەوەو جانتاکانمان کردەشانمان، بەڵام نە ئێمەو نە ئەوانەی بەجێمان دەهێشتن، دڵمان نەدەهاتو نەمان دەتوانی بڵێین خوداحافیز، سینەمان تەنگ ببوو، قوڕگمان پڕگریان بوو، چاوەکانمان پڕ فرمێسك، بەڵام هەوڵمان دەدا خۆمان بگرینو بەسەرخۆماندا زاڵبین، سەرەنجام هیچ وشەیەکمان بۆدەرنەبڕا، تەنها دەستەکانمان بەرزکردەوەو هەر بەدەست خوا حافیزیو ماڵاواییمان لە یەکتر کردو سواری ئۆتۆمبێلەکەبووینو بە ڕێکەوتین، ئەوانمان بەجێهێشت، ئەوانیش لە بەلەکۆنی بەشەناوخۆییەکەوە بە چاوی پڕ فرمێسك هەرسەیریان دەکردین، تا لە یەکتر ونبووین.

هەربۆیە تکادەکەم، لە هەر شوێنێك بوویت، نەکەیت دڵی هاوڕێکانت بڕەنجێنیت، چونکە چوارساڵی ئێمە، وەك یەك شەو ڕۆژ وابوو، سەرەنجام ماڵاواییمان لەیەك کردو یەکتریمان بەجێهێشت، کێ ناڵێت بەیانی بە یەکجاری کۆچ ناکەینو بە هیچ جۆرێك نە هاوڕێکانمان دەبینینەوەو نە ئەوان ئێمە دەبیننەوە، تاکو داوای گەردن ئازادییان لێبکەینو داوامان لێبکەن!

# چۆن دەتوانی هاوسەرەکەت لە جگەرەکێشان دووربخەیتەوە؟



کلسوم جلال

ئافرەتێکی زیرەکو بە توانا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: هاوسەرەکەم ئالـودە ببوو بـە خویەکی خراپەوە، ئەویش جگەرە کێشـان بوو، سـەرەتا هەوڵمـدا ڕازی بکـەم تـا واز لە جگەرەکێشـان بهێنێت، بەڵام ڕازی نەبوو، بـەردەوام بووم لە هەوڵەکانم، چەندین ڕێگەم لەگەڵیدا بەکارهێنا..

لـە سـەرەتادا بە ناڕاسـتەوخۆ ئامۆژگاریم دەکـرد، دواتر بە ڕاستەوخۆو ئاگادارکردنەوەو قسەکردن لەو بارەوە، ڕوونکردنەوەی زەرەرو زیانەکانی بۆ خۆیو دەوروبەری.

هەمـوو جار بەبیرم دەهێنایەوە کە ئـەوە نەریتێکی خراپەو زیانی زۆری بۆ تەندروسـتی هەیە، لەگەڵ ئەوەشـدا دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی پارەو سـامانو بێزارکردنی کەسـانی دەوروبەر، بەڵام بەداخەوە نەگەیشـتمە هیچ ئەنجامێك، سـەرەڕای سەرنەکەوتنی هەوڵەکانـم، بێهیـوا نەبـووەو هـەر بـەردەوام بـووم لەگەڵیدا، ئەمجارەیـان ڕێگەیەکـی ترم لەگەڵیدا بەکارهێنـاو پێمگوت: ئەو پارەیـەی کە بۆ کڕینی جگەرەکێشـان خەرجـی دەکەیت، موڵکی هەمـوو ئەندامانی خێزانەکەیە، تەنها تۆ خاوەنی نیت، لەبەرئەوە تـۆ ناتوانیت بەبـێ ڕەزامەندی ئێمەو بە ئـارەزووی خۆتو هەر چۆنـت بوویێت ئاوا خەرجی بکەیت، بۆیـە بەرامبەر کڕینی هەر پاکەتێـك جگـەرە، دەبێت هەمـان بڕە پارە بدەیـت بە ئێمە، بۆ نموونـە ئەگەر نرخی هـەر پاکەتێك جگـەرە (٢٠٠٠)دینار بێت، دەبێـت (٢٠٠٠)بدەیت بە ئێمە، هاوسـەرەکەم پێکەنی: لە جیاتی (٢٠٠٠) دینـار مـن دەتوانـم (٥٠٠٠)دینارتان بدەمـێ، بەس وازم لێبێنن، با بە ئازادی جگەرە بکێشم..

ئـەم کارە بـۆ ماوەیەك بـەردەوام بوو، هاوسـەرەکەم ڕۆژانە (٥٠٠٠)دیناری پێدەدایـن، بەرامبەر کڕینی دوو پاکەت جگەرە کە دەیکێشـا، وامزانی کە بەم کارە هاوسـەرەکەم واز لە جگەرەکێشان دەهێنێـت، بەڵام سـوودی نەبوو، ئـەم ڕێگەیەش نەبـووە ڕێگر لەبەردەمی هاوسەرەکەمدا بۆ وازهێنان لە جگەرەکێشان..

سەرەڕای شکستهێنانم لەسەرجەم هەوڵەکانمدا، هەر بەردەوام بـووم، بەردەوام بیرم لە بیرۆکەو ڕێگەی نوێ دەکردەوە تا بتوانم هاوسـەرەکەم لەو نەریتـە خراپـە دووربخەمـەوە، ئەمجارەیان بڕیـارم دا ئـەو پارەیەی پێم دەدات، لە بری جگەرەکێشـانەکەی، لەبەرچـاوی خۆی بیسـوتێنم، ئیدی لەو ڕۆژە بـەدواوە هەر کات پارەکەم وەردەگرت لەبەرچاوی خۆیدا دەمسـوتاند، هاوسـەرەکەم ئەو کارەی پێناخۆشـبوو، پێی وتم: ئەوە کارێکی هەڵەیە، دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی پارەو سامانی خێزانەکەمان بەبێ سوود.

وەڵامم دایەوە: تۆ ئازادیت کە چۆن پارەکانت خەرج دەکەیتو لـە چیدا بەکاریدەهێنیـت، ئێمەش ئازادین لەوەی بەشـە پارەی خۆمان چۆن خەرج بکەین، یان چی لێ بکەین، هەردوو لامان پارە دەسـوتێنین، بەڵام بە شێوازی جیاواز، هاوسەرەکەم ئەم کارەی پێ قبوڵ نەدەکرا، چونکە ئەو خۆی ماندوو دەکات بۆ بەدەسـتهێنانی پارەو سـامان، بەڵام زۆر بە ئاسـانی من دەیسوتێنیم. بۆیە کەوتە بیرکردنەوەو ئەم ڕاستییەی بۆ دەرکەوت، هەر بۆیە پێی گوتم: لە ڕاسـتیدا وایە، هەردووکمان پارە دەسـوتێنین، بەڵام تەنها شێوازی سـوتاندنەکەمان جیاوازە، ئـەم بیرکردنەوەیە وایکرد کە واز لەم خووە خراپە بهێنێت..

بەمەش توانیم هاوسـەرەکەم لە نەخۆشییەکی کوشندە ڕزگار بکەم، کە سەرەنجامی هەموو جگەرەکێشێکە..

# پەیوەندی دایك بە کچەکەیەوە!



ن: دکتۆر عەلی ئەلقائیمی
و: حەیدەر حەمەصاڵح

بەشی یەکەم

دایــك یەکێکــە لە کۆڵەکە هــەرە گرنگەکانــی ڕێچکەی ژیان، بەشــێکە لە خاڵە زۆر گرنگەکانی ژیانی خێزانو کۆمەڵگە، ژیانی مــرۆڤ لەگــەڵ دایك دەســتپێدەکاتو هەر لە ڕێگەی ئەویشــەوە مــرۆڤ دەتوانێت هەموو جیهانو ئەوەی تێیدایە بیناســێت، هەر لەو ڕێیەوە دەتوانێت هەموو یاســاو بڕیارە ڕەوشتییەکانو هەموو وێســتگەکان بناسێتو بڕیاری خۆی لەســەر ئەو ساتانە بدات کە تێیدا ڕووداوەکان ڕوودەدەن.

پێشکەوتنی هەر کۆمەڵگەیەك پابەندە بە دایکەوە، خۆ ئەگەر دایك لە پێشــکەوتندا نەبێت، ئەوە نــەوەکانو پیاوەکانیان ناگەن بە ئاستی پێشکەوتنو گەشەسەندن، ئەگەر دڵی منداڵ لە ئارامیو هێمنیدا نەبێت، ئەوا کۆمەڵگە ناگات بە ئارامیو سرەوتن.

باوەشــی دایــك بــە پێــی ئــەو گرنگییــەی کــە هەیەتی بە قوتابخانەیەکــی نموونەیــی دادەنرێــت، کە منداڵێکــی دیاری وا بەرهەمدەهێنێت کە هەموو ئەو ڕێگاو یاســایانەی کە پێویســتی پێیەتی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە شێوەیەك بێت کە هەتا کۆتایی ژیانی کاریگەری لەسەری دەبێت.

ئەو کەســانەی کە لە باوەشی گەرمی دایکیاندا بە پەروەردەیەکی گونجــاو پەروەردەکراون، بە کەســانی بەتواناو لێهاتــوو ناودەبرێن، چونکە ئەوان دەتوانن وانەیەکی وافێر ببن کە ببنە کەسانی بانگخوازو چاکەخوازو تێگەیشتوو، ئەمەش بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەلمێنرێت کە لە باوەشــی ئــەو دایکانــەدا پــەروەردە دەبن کــە لادەرنین، بە پێچەوانەشــەوە زۆرجــار دەبینیــن کــە ئەوانــەی لەســەر خراپەو خراپەکاری پەروەردە دەبن، بەڕەوشتی دایکیانەوە دەناسرێنەوە.

### ڕۆڵو کاریگەری دایك:

لەگــەڵ ئــەوەی کــە پەیوەندییەکــی پتــەو هەیە لــە نێوان بــاوكو دایك لە بــواری بۆ ماوەییدا، بەڵام پێویســتە ئەوە بڵێین کە دایــك کاریگەری زیاتــری هەیە لە باوك لەســەر نەوەکانیان، ئــەوەش هۆکارەکــەی ئەوەیە کە منداڵ بۆمــاوەی نۆمانگ لە نێو ســکی دایکیدا دەمێنێتەوە، بۆماوەی دوو ساڵ شیری پێدەدرێت لە دوای لــە دایکبونییەوە، لە کاتێکدا ئەم پەیوەندییە لە گەڵ باوکدا دەبڕدرێت لە دوای کۆبوونەوەی تۆوو هێلکە.

بەڵام لەســەر ئاســتی چواردەورو پەیوەندی بە دەوروبەرەوە، پەیوەنــدی منداڵ بــە دایکەوە زیاترە لە پەیوەنــدی بە باوکەوە، لەبەرئــەوەی لــە دوای لــە دایکبوونــەوە بۆ ماوەی دوو ســاڵ لە باوەشــی دایکیدا پەروەردە دەبێت، بەشــێوەیەکی بەردەوام لێیەوە نزیکــە، لە دوای ئــەوەش ئــەو پەیوەندییە بــەردەوام دەبێت تا دەچێتە قوتابخانەی ســەرەتاییو کاریگەر دەبێت بە هەڵسوکەوتو خوڕەوشــتو ڕێچکەی ئەو دەگرێتو دەبێتــە هاوڕێی بەردەوامی، ئەم کارەش کاریگەری بۆ ســەر کچان زیاتر دەبێت بەو پێیەی کە دەبێتە گەنجینەی نهێنییەکانی یەکتر.

کچ هەمیشە لە دایکەوە نزیکە، لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ماڵەوەدا، دایك کاریگەری زۆری دەبێت لەســەر کچەکەی بەشێوەیەك ســۆزو ڕەوشــتەکانی لێوە وەردەگرێت، پەیوەنــدی نێوان دایكو کچ پەیوەندییەکی زۆر پتەوە، بە شــێوەیەك کە کەس باوەڕ ناکات ئەم پەیوەندییە تێکبچێت، لەســەر ئەم بنەمایــە دایك ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێــت لە گرتنەخۆو پەروەردەکردنــی نەوەکانیدا، ئەو منداڵەی کە لە باوەشــی دایکیدا گەشــەدەکاتو پــەروەردە دەبێت، دەتوانێت بە دەیەها کاریگەری لەســەر هەبێت، پاشەڕۆژی منداڵەکان پابەندە بە پاشــەڕۆژی دایکانیانەوە، دایك ســەرچاوەی ئارامیو هێمنییە بۆ منداڵ، منداڵ جگە لە دایك بە هیچ کەسێکی تر دڵی ناکرێتەوە.

### ڕۆڵو کاریگەری ڕەوشتی دایك:

کەسایەتی کچ تاڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بەدایکیانەوە، ئەویش بــە هۆی ئــەو نزیکــیو هاوڕێیەتییەیە لێیەوە، بۆیــە کاریگەری لەسەر دەبێتو لێوەی فێردەبێت، ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت لەسەری،

له رووی خوره‌وشته‌وه له ئێستاو داهاتوویدا، کۆشی گه‌رمی دایك داده‌نرێت به قوتابخانه‌یه‌ك كه تێیدا فێری ره‌وشته‌كان ده‌بێت، دایك به‌هۆی ئه‌و رۆڵه‌ی كه هه‌یه‌تی‌و به‌هۆی ئه‌وه‌ی كچه‌كه‌ی به‌رده‌وام لێوه‌ی نزیكه، ده‌توانێت په‌روه‌رده‌ی بكات له‌رووی ره‌وشتی‌و بیروباوه‌رو هه‌ڵسوكه‌وته‌وه، كه هاوشێوه‌ی ره‌وشته‌كانی خۆی واته دایكی بێت.

ئه‌گه‌ر دایك له‌گه‌ڵ هاورێكانی دانیشتو ده‌ستیانكرد به زه‌مكردنی هاورێكانی تریان‌و چه‌ندین وشه‌ی ناشیرین‌و سوك‌و قێزه‌ون له ده‌میان ده‌رده‌چوو، دایكه‌ش ده‌زانێت كچه‌كه‌ی له ته‌نیشتیه‌وه دانیشتووه، به‌ڵام بیر له ئاینده‌ی ئه‌م منداڵه‌ی ناكاته‌وه كه ئه‌و ره‌فتاره ناشیرینانه كاریگه‌ری ده‌بێت له‌سه‌ری.

## رۆڵی واتایی دایك:

پێویسته دایكان منداڵه‌كانیان فێری داوێنپاكی‌و پارێزكاری‌و نییه‌ت پاكی‌و پاكییه‌تی‌و له خواترسانیان بكه‌ن، چونكه دایك رۆڵی پێشه‌نگ ده‌بینێت له ژیانی رۆژانه‌یانداو كاریگه‌رییه‌كانی دایك له بیروهۆشیاندا ده‌مێنێته‌وه تا كۆتایی ژیانیان، كاتێك ده‌بینێت دایكی ملكه‌چه له به‌رامبه‌ر فه‌رمانه‌كانی خوادا، ئاماده‌یه خۆی فیدای بكات، كچ كه ده‌بینێت دایك له به‌شێكی شه‌ودا هه‌ڵده‌ستێت شه‌ونخونی ده‌كات‌و یادی خودا ده‌كات، هیچ گومانی تێدا نییه كه به‌و ره‌فتارانه كاریگه‌ر ده‌بێت له جێبه‌جێكردنی به‌ندایه‌تی كردندا، دایكان ده‌توانن ببنه سه‌رچاوه‌یه‌ك بۆ گه‌وره‌یی‌و پارێزكاری‌و به‌ندایه‌تی بۆ خوای په‌روه‌ردگار، هه‌روه‌ها دایك له توانایدایه كه خۆشه‌ویستی خودا بگوێزێته‌وه بۆ نه‌وه‌كانی‌و كاریگه‌رییه‌كیان له‌سه‌ر دروستده‌كات، كاریگه‌رییه‌ك كه وایلێ بكات پابه‌ند بێت به خۆشه‌ویستی خواو به‌ندایه‌تی بۆكردن‌و گوێرایه‌ڵی له فه‌رمانه‌كانی، خۆ ئه‌گه‌ر گه‌وره‌یی خوای په‌روه‌وردگار له دڵی دایكه‌كاندا نه‌بوو، یان ئه‌گه‌ر دایك نه‌یتوانی كاریگه‌رییه‌كی وای هه‌بێت له جێبه‌جێكردنی رێنماییه‌كان‌و فه‌رمانه‌كانی خوادا كه سه‌رنجی منداڵه‌كانی بۆ لای خۆی پێ كه‌مه‌ندكێش بكات، یان نه‌گه‌یشته ئاستێكی هۆشیاری باش به ئه‌ندازه‌یه‌ك تا له خوا بترسێت‌و به‌ندایه‌تی بۆ بكات، جگه له خوا له كه‌سی تر نه‌ترسێت، ئه‌وا گرفته‌كانی مرۆڤایه‌تی هه‌ڵده‌وه‌شێنێت.

## هه‌ڵسوكه‌وتی دایك‌و ره‌وشته‌كانی:

ده‌توانین بڵێین هه‌ڵسوكه‌وتی دایك‌و ره‌وشته‌كانی بۆ خۆشبه‌ختی كچ‌و ناخۆشییه‌كانی تاراده‌یه‌كی باش په‌یوه‌ندییه‌كی به‌هێزی هه‌یه، ده‌بێت ئه‌وه بزانێت كه هه‌ر هه‌ڵسوكه‌وتێك ئه‌نجامی ده‌دات، وه‌ك ده‌نكه تۆوێك وایه كه ده‌یچێنێت له ناو بیره‌وه‌ریه‌كانیداو تێكه‌ڵ به مۆخی ده‌بێت، هه‌موو كاره‌كانی ره‌نگدانه‌وه‌ی ده‌بێت له‌سه‌ر كچه‌كه‌ی.

كاره‌كانی دایك به باش‌و خراپی‌و خۆشه‌ویستی‌و چاكه‌و شه‌ڕییه‌وه، چاكه‌كاری‌و به‌خشینه‌كانی، پاراستنی زمانی له زه‌م‌و هه‌ڵبه‌ستنی تاوان‌و گوناهو درۆكردن، هه‌ریه‌كه له‌وانه كاریگه‌ری ته‌واوی ده‌بێت له‌سه‌ر نه‌وه‌كانی، به‌تایبه‌ت كچه‌كه‌ی، كه هه‌میشه له ته‌نیشتییه‌وه‌یه‌تی‌و لێوه‌ی نزیكه، ته‌نانه‌ت له كۆڕو كۆبونه‌وه ژنانییه‌كاندا پابه‌نده به دایكییه‌وه، به‌شێوه‌یه‌ك ده‌بینین كه هه‌رچی كارێك كه فێری بووه له دایكییه‌وه فێربووه، هه‌مان ئه‌و كردارانه‌ش له نێو هه‌ڵوێسته خێزانیه‌كانیدا دووباره ده‌كاته‌وه، ته‌نانه‌ت له‌گه‌ڵ هاوسه‌رو منداڵه‌كانیشیدا، چونكه هه‌ڵسوكه‌وتی دایك‌و ره‌وشته‌كانی بووه‌ته پێشه‌نگ بۆی‌و باوه‌ڕی ته‌واوی پێیه‌تی، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌مه‌شه كه به‌رپرسیاریه‌تی دایك، به‌رپرسیاریه‌تییه‌كه گه‌وره‌یه له به‌رده‌م خودادا.

ئارام نه‌بی مه‌حمود



# لێبوردن، یان تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه؟

بێگومان هیچ مرۆڤێك نییه هه‌ڵه نه‌كات، هه‌ر له‌باوكه ئاده‌مه‌وه تادوا مرۆڤی سه‌ر ئه‌م زه‌وییه، (جگه له په‌یامبه‌ران (سه‌لامی خودایان لێبێت))، هه‌مووما‌ن شایسته‌ی هه‌ڵه‌كردنین، بۆیه هه‌ڵه‌كردن شتێكی ئاساییه‌و لات سروشتی بێت، هه‌ڵه‌كردنیش چه‌ند جۆرێكی هه‌یه، هه‌ڵه‌كردنی مرۆڤ به‌رامبه‌ر به‌خودی خۆی، هه‌ڵه‌كردنی مرۆڤ به‌رامبه‌ر مرۆڤ، هه‌ڵه‌كردنی مرۆڤ به‌رامبه‌ر خودای گه‌وره، هه‌ریه‌كێك له‌م جۆرانه‌ش پێویستی به هه‌ڵسوكه‌وتو مامه‌ڵه‌ی تایبه‌ت هه‌یه، ئه‌وه‌ی كرۆكی بابه‌ته‌كه‌مانه هه‌ڵه‌كردنی مرۆڤه به‌رامبه‌ر مرۆڤ.

ئێستا ده‌پرسم: كاتێك كه‌سێك هه‌ڵه‌ت به‌رامبه‌ر ده‌كات، ئایا هه‌ڵسوكه‌وتو مامه‌ڵه‌ت چۆن ده‌بێت به‌رامبه‌ر به‌و كه‌سه؟

ئایا بڕیاری لێبوردن، یان تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه ده‌ده‌یت؟ تۆ سه‌ربه‌ستی له هه‌ڵبژاردنی هه‌ریه‌كێكیان، به‌ڵام په‌له‌مه‌كه، بڕیاره‌كه‌ت دوابخه تا دوای خوێندنه‌وه‌ی ئه‌م بابه‌ته.

لێبورده‌یی به‌خشینه، قوربانیدانه، كارێكه مرۆڤ به‌ره‌و لوتكه‌ی به‌رزی ده‌بات، لێبورده‌یی ئه‌و بۆنه‌یه كه گوڵ ده‌یبه‌خشێت له كاتی هه‌ڵوه‌رینیدا، لێبورده‌یی ئاسوده‌یی‌و ئارامی بۆ مرۆڤ به‌خه‌ڵات دێنێت، لێبورده‌یی له كاری مرۆڤه گه‌وره‌كانه، زۆر كه‌س لێبوردن به‌شكست ده‌زانن، به‌ڵام نازانن كه لێبوردن پێویستی به‌هێزێكی گه‌وره‌تره له تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه، لێبورده‌یی هۆكارێكه بۆ زیادكردنی ته‌قواو نزیكبوونه‌وه له خودای گه‌وره، بۆیه ئه‌گه‌ر بۆ ته‌نها جارێكیش بووه، ببوره بۆئه‌وه‌ی چێژی لێبوردن بزانیت.

هه‌رگیز خۆت مه‌ده له قه‌ره‌و به‌ره‌ی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه، چونكه له مه‌یاندا خۆت زیاتر ئازارده‌چێژی، به‌هۆی ئه‌مه‌وه مرۆڤ هه‌موو كات له ڕاڕایی ژیان ده‌گوزه‌رێنێت، هه‌روه‌ها واده‌كات دڵه‌كان ژه‌نگی ڕق‌و كینه هه‌ڵبگرن، نه‌ك هه‌ر واز له تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه بێنه، به‌ڵكو بۆ ساتێكیش ڕێگه به‌خۆت مه‌ده كات به‌فیڕۆ بده‌یت، به بیركردنه‌وه له كه‌سانێك كه هه‌ڵه‌یان به‌رامبه‌ر كردوویت، یان كه‌سانێك كه دۆستت نین‌و خۆشیان ناوێیت، ئه‌وه بزانه كه له تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه زه‌ره‌رمه‌ندو خه‌ساره‌تمه‌ندی سه‌ره‌كی، تۆ ده‌بیت، لوقمانی حه‌كیم ده‌ڵێت: هه‌میشه دوو شت له بیر بكه، چاكه‌ی خۆت به‌رامبه‌ر خه‌ڵك، هه‌روه‌ها خراپه‌ی خه‌ڵك به‌رامبه‌رت.

هه‌موو ئه‌و مرۆڤانه ببه‌خشه كه له ژیانتدا هه‌ڵه‌یان به‌رامبه‌ر كردوویت، ئه‌و ڕابردووه له بیربكه كه وات لێده‌كات ڕقت هه‌ڵسێت به‌رامبه‌ر خه‌ڵك، گه‌وره‌ترین دیاری چاوپۆشین‌و لێبوردنه، گه‌وره‌ترین لێبوردنیش له كاتی ده‌سه‌ڵاتدایه.

پیره‌مێردی شاعیر ده‌ڵێت:

مرۆڤ ده‌بێ شێوه‌ی شه‌معی بێ
بۆ خۆی بسوتێ‌و نه‌فعی جه‌معی بێ

نامەی حەوتەم



# نامە نورینەکان

هێشتا خۆر ئاوا نەببوو، گوێم لەم سرودە دەگرت:

قف بالخضوع وناد يا ألله      إن الكريم يجيب من ناداه

بووەستە بە ملکەچیو بانگکە (یا ألله)، خودای میهرەبان وەڵامی کەسێك دەداتەوە کە بانگی دەکات..

بە دڵێکی شکاوو چاوێکی شەرمنەوە دەستی دوعام بڵند کـــرد، وەلێ لەو کاتەدا وتەکانی (ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) م هاتنەوە خەیاڵ، کاتێك لێیان پرسی: بۆچی ئێمە لە خودا دەپاڕێینەوە، بەڵام پەروەردگار دوعاکانمان قبوڵ ناکات؟

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: چونکە ئێوە خوداتان ناسیوە، بەڵام ملکەچی فەرمانەکانی نەبوون!

پێغەمبەرتـــان (ســـەلامی خوای لێبێت) ناســـیوە، بەڵام گوێڕایەڵی سوونەتەکانی ئەو نەبوون!

قورئانتـــان ناســـیوە، بـــەڵام کارتـــان بـــە ڕێنماییەکانی نەکردووە!

لە ڕزقو ڕۆزیو نیعمەتی خودا دەخۆن، بەڵام سوپاســـی ناکەن!

بەهەشتان ناسیوە، بەڵام داوای ناکەنو کاری بۆناکەن!

دۆزەختان ناسیوە، بەڵام لێی ڕاناکەنو خۆتانی لێناپارێزن!

شەیتان دەناسن، بەڵام دژایەتی ناکەن، بەڵکو کردووتانە بە دۆستی خۆتان!

دەزانن مردن هەیە، بەڵام خۆتانی بۆ ئامادە ناکەن!

دەچنە گۆڕســـتانو مردووەکان بە خاك دەسپێرن، بەڵام هیچ پەندو ئامۆژگارییان لێوەرناگرن..

عەیـــبو ناتەواوییەکانی خۆتان بیرچـــووەو بە عەیبی خەڵکییەوە خەریکن!

ئیتر چۆن دەتانەوێت نزاکانتان قبوڵ بێت؟!

تەماشا دەکەم هەموو ئەم شتانە لە مندا هەن، بەڵام هەر بـــێ ئومێد نەبووم لە میهرو بەخشـــندەیی خودایی، وێڕای تـــاوانو گوناهی بێ ئەندازەی ئێمە، دەرگای لێخۆشـــبوونی خودایی هەمیشە والآیە!!

هەرگیـــز نابێت لە بەزەیـــیو میهرەبانی خودا بێ هیوا بین، هەرچەندە غەرقی گوناهو تاوان بین!

خودای گەورە، بەندەی تۆبەکاری خۆی خۆشدەوێت، لە کاتی تاوانو گوناهیشـــدا پەردەی میهری خۆی لەسەر بەندە گوناهبارەکانی خۆی لانابات!

ئیبنولجـــەوزی کتێبێکی نایابی هەیـــە، بە نێوی (بحر

الدموع)، (دەریای فرمێسك)، تایبەتە بە چیرۆکی ئەو بەندانەی تۆبەیان کردووەو گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا!

تیایدا سەرنجێکی جوانی (بشری حافی) باسدەکات، کە ڕۆژێك لەبەردەم دووکانی میوە فرۆشێك ڕادەوەستێت، پێی دەڵێت: دەڵێی ئارەزووی شتێك لەمانە دەکەیت؟

گوتی: نەخێر، تەنها سەرنجم لەوەدا کە خودای گەورە ئەم هەموو میوە خۆشو بەتامە لە دنیادا بە کەسانێك دەبەخشێت، کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەنو لێی یاخین، ئەی دەبێت لە بەهەشتدا چی بەو کەسانە ببەخشێت، کە ملکەچی فەرمانەکانی بوونو سەرپێچییان نەکردووە؟!

خودایەك هێندە میهرەبان بێت، چۆن دەبێت ئێمە لە لوتفی بێهیوا بین؟!

مرۆڤ بەرامبەر بە وەها لوتفێکی بێ سنور سەری سوڕدەمێنێت، هەمیشە دەرگا والایە، هەر کات بتەوێت بچیتە خزمەتی خودا، سکالای خۆت بکەی، موناجاتی لەگەڵ بکەی، بیدوێنیو دەردی دڵی خۆتی بۆ بەیانکەی، دەتوانیت!

چی لوتفێکە خودا گیان، ژووانی هەمیشە ئاوەدان، هەواری هەمیشە ڕازاوە، میحرابی بەردەوام، بەرماڵی هەمیشە ڕاخراو، تۆ ئەی بەندەی گوناهبار، دڵۆپێك ئەسرینو دوو دەستی بڵندو دیدەیەکی کزو دڵێکی شکاوو تەوبەیەکی ڕاست، هەموو گوناهەکانت دەشۆنەوە، خۆشبەختی کوچەو کۆڵانی دڵو دەروونت ڕووناك دەکاتەوە، ئای ساتەکانی موناجات، چ خۆشیو لەززەتێك بە مرۆڤ دەبەخشن..

ئازیزم، دەچینەوە خزمەتی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، پێی دەڵێن: مامۆستای زوهدو خوداپەرستی ئامۆژگاریمان بکە بە شتێك سوودمان پێ بگەیەنێتو تووێشوو بێت بۆ گەشتی قیامەتمان!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم: کاتێك دەبینین خەڵکی سەرقاڵی دنیان، ئێوە سەرقاڵی قیامەتبن.

ئەگەر ئەوان خەریکی ڕازاندنەوەی ڕووکەشیان بوون، ئێوە خەریکی ڕازاندنەوەی ناخی خۆتان بن!

ئەگەر ئەوان خەریکی بنیاتنانی کۆشكو تەلاری دنیا بوون، ئێوە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی گۆڕو کۆشكو تەلاری قیامەتبن!

ئەگەر ئەوان خەریکی خزمەتکردنی مرۆڤەکان بوون، ئەوا ئێوە خەریکی خزمەتکردنی خودای پەروەردگاری جیهانیان بن!

ئەگەر ئەوان بە عەیبی خەڵکەوە سەرقاڵبوون، ئێوە خەریکی چاککردنی عەیبەکانی خۆتان بن!

هەوڵدەن، لەم دنیایەدا کەشکۆڵو توێشووی قیامەتتان ئامادەکەن، چونکە ئەم دنیایە کێڵگەیەکە بۆ قیامەت!

ئەمانە وتەی پیاوێکی حەکیمن، هیوادارم هەردووکمان وانەی جوانی لێوە فێربینو بیکەینە، مەشخەڵی ڕێمان.

هیلال



## هەمیشە لە یادمانن!!

لەو گوڵە سیسە بێزار مەبە...
که ڕۆژانێك گوڵاوی بۆنخۆشی بەسەردا باراندی!
لەو دڵە پڕجۆشو خرۆشە مەڕەنجێ، ڕۆژانێك هەموو خۆشەویستیو نازی خۆی پێبەخشیت!
ئەو چاوەت بیر نەچێت...
زەمەنێك فرمێسکی بۆ ڕشتیت!
ئەو دەستەت لە یاد نەچێت...
تا لە چاو وندەبوویت ئێواران ماڵاوایی لێدەکردیت!
چرپەیەك لە هەستی پڕ سۆزو ئەوینی مرۆڤێکی دڵسۆزو ڕاستگۆو میهرەبان..
بەسەروەتو سامانو گەنجینەی هەموودنیا بەراورد ناکرێت!
با مرۆڤە ڕاستگۆکان، هاوڕێ دڵسۆزەکان..
دڵە سپییەکان فەرامۆش نەکەین..
ئەوان هەوری بەهارێکن..
هەمیشە سۆزو ئەوینو خۆشەویستییان لێدەبارێت..
ئەوان ژووانی بەهارستانێکن.....
هەمیشە گوڵبارانمان دەکەن..
ئەگەر خۆری لێوی پڕ خەندەی ئەوان ئاوابێت......
ئیتر ڕۆژی ڕووناکی ئێمە دەبێتە شەوە زەنگ!!.

پێش ماڵئاوایی



# لەگەڵ ئەحمەد موختار بەگی جاف دا

ئیزنی دام دولبەر کە بچمە زیارەتی دەرگانەکەی
شەمعی ڕەخشان وا قبوڵی کرد، شوکور پەروانەکەی
ئاسمان حەقیە بەخیل بێتو فرێدا مانگو خۆر
لەو دەمەی یار خۆی نواندو هاتە ناو هەیوانەکەی

(ئەحمەد موختار بەگی جاف، کوڕی وەسمان پاشای گەورەی جاف)ە، وەسمان پاشای باوکیو مەحمود پاشای مامی، هەردووکیان لە میرە بەناوبانگەکانی عەشیرەتی جاف بوونو لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەوە، ڕوتبەی پاشایەتییان پێدرابوو.

ساڵی (١٨٩٧)ی زاینی لە دایکبووەو ساڵی (١٩٢٢) قایمقامی هەڵەبجە بووەو لە ساڵی (١٩٢٤) بووە بە نوێنەر لە پەرلەمانی عێرقدا.

شاعیر مرۆڤێکی کوردپەروەرو نیشتمانپەروەرو میللەتدۆست بووەو هەموو ئاواتی سەربەرزیو سەرکەوتنی میللەتەکەی بووە.

شیعرەکانی نموونەی بەرزی بەرخودانو بەگژاچوونی واقیعی نالەباری سەردەمی خۆی بووە.

عادەتی ئەم چەرخە وایە، ئەهلی دڵ غەمگین ئەکا
شا هەمیشە ماتە، پیادە مەیلی جێی فەرزین ئەکا
ئەبلەهـ وا دایم لە عەیشو شادومانیو عیززەتا
ئەهلی عیرفانو کەماڵ، ئێستاکە زاریو شین دەکا
دوژمنە چەرخی فەلەك، بۆ پیاوی ساحێب عەقڵو هۆش
ڕووی کەرەم دایم لە هەرزەو شێتو بێ تەمکین ئەکا

هەڵبەستی بەناوبانگی (لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد) بە یەکێك لە شیعرە نەتەوەییە بەرزەکانی شاعیر دادەنرێت..

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد، خەو زەرەرتانە
هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەزڵو هونەرتانە
دەسا تێکۆشن، ئەی قەومی نەجیبی بێکەسو مەزڵوم
بە گورجی بیبڕن ئەو ڕێگە دوورە والەبەرتانە
بخوێنن، چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئانو زەمانێ عەینی قەڵغانو سوپەرتانە

وێڕای ئەوەی (ئەحمەد موختار بەگ) شاعیرێکی بێ وێنە بووە، لە شیعری غەزەل داو خاوەنی هەستو تەعبیرێکی زۆر جوان بووە..

خوێنی دووچاوم بە نەوعێ، دامەنم ڕەنگین ئەکا
هەر کەس ئەمبینێ، بە حاڵی ناتەوانم شین ئەکا
شێخی ئیرشادو موریدو سالیكو سۆفیو فەقێ
ئەو بە یەك نواڕین بە جارێ کافرو بێ دین ئەکا

یاخود دەڵێت:

لە داخی سیلسیلەی توڕڕەی نیگاری نازەنینی خۆم
ئەبێ تەرکی وەنەوشەو سونبولو هەم عەترو عەنبەرکەم
ئەڵێن دولبەر لەگەڵ مندا دڵساردە، ڕەقیب شادە
ئەبێ خاكو گڵی عالەم، ئیتر من هەر لەسەر سەرکەم

هەروەها دەڵێت:

زوبانی حاڵی بولبول هەر ئەڵێ، ئەی گوڵ فیدای تۆبم
ئەگەر مومکین نییە، وەسڵت بە دیاری بمدەرێ خارێ
ئەگەر یادی سەری زوڵفت لە بیرم دەربچێ جانا
لە سەحرای عەشقی تۆدا بمگەزێ، یارەبی ڕەشمارێ

(ئەحمەد موختار بەگ) وێڕای ئەوەی بە شیعرەکانی هەمیشە بەرگری لە مافی میللەتەکەی کردووە، هەموو تەمەنیشی هەر لەو ڕێگایەدا بەخت کرد، چی ئەدەب دۆستو میللەتپەروەرێك هەیە، ئەم شیعرە بەرزەی موختاری نەبیستبێت:

دێتە گوێم دەنگێ بە سۆزو شیوەنو گریانەوە
ناڵەیی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە
لانەوازو بێکەسو مەزڵومن ئێستە قەومی کورد
گا بە دەستی تورکەکان و گا بەدەست ئێرانەوە
ئیسمی ویجدانو عەدالەت بێ موسەممایەو درۆ
بۆ سیاسەت ئەم قسە کەوتۆتە سەر لێوانەوە
ڕاستە گەر ئیسمی عەدالەت، بۆچی منداڵانی کورد
وێڵو سەرگەردان، بسوڕێنۆ بەسەر کێوانەوە

سەد مخابن، لە تەمەنی (٣٨) ساڵیدا لە ساڵی (١٩٣٥) بە گوللەی دەستێکی پیس لەسەر ئاوی (سیروان)، جوانەمەرگ بوو.

تەرمەکەی لە ئاوایی (عەبابەیلێ) لە نزیك تەرمی تاهیر بەگی برای بە خاك سپێردرا.

شێخانی